# پۆشاکی ئافرەتی موسڵمان

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

کەناڵی الفضیلة والعفاف لە تێلیگرام
کەناڵەکانی آثار وفوائد سلفية لە تێلیگرام

وەرگێڕانی

باوکی شام و دایکی شام



MahrenDesign

## الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه أما بعد :

ئەمە بەشێکی بچووکە لەباسکردنی پۆشاکی ئافرەتی موسوڵمان و ئەوەی پەیوەندی پێوەی هەبێت، هەرچیەک دەربارەی هاتبێت لەئایەت و فەرموودە و آثار تیایدا کۆکراوەتەوە.

پێش دەست پێکردن بە باسکردنی ئایەت و فەرموودە، سەرەتا پێناسەی ئەو ووشانە دەکەین کە زۆر باس دەکرێن لەم بابەدا.

یەکەم

## پێناسەکان

- **الجلباب:**

ووتراوە جلباب خیمارە-سەرپۆش-، وە ووتراوە: جلباب ئەو پۆشاکەیە کە ئافرەت گیانی هەمووی پێدادە پۆشێت، مفردی ووشەکە جلبابە و کۆی ووشەکە پێی دەوترێت جلابیب.

وە ووتراوە : جلێکە پانترە لە سەرپۆش -خیمار- و بچووکترە لە جل و بەرگی لاشە، ئافرەت سەری و سنگی پێ دادەپۆشێت.(١)

وقال الطبري: هو القناع الذي يكون فوق الخمار، والرداء الذي يكون فوق الثياب

الطبري دەفەرمووێت: ئەو پۆشاکەیە کە دەمووچاوی پێ دادەپۆشرێت کە بەسەر خیماردا دەکرێت، وە ئەو جلەشە کەئافرەت لەبەری دەکات بەسەر پۆشاکەکانی تری لاشەی.- وەک عابا-.(٢)

(١) تهذيب اللغة للأزهري (١١/٦٤)
(٢) تفسير الطبري (١٩/ ٢١٦)

وقال ابن تيمية : والجلباب هو الملاءة وهو الذي يسميه ابن مسعود وغيره الرداء، وتسميه العامة الإزار ، وهو الإزار الكبير الذي يغطي رأسها وسائر بدنها.

وقد حكى أبو عبيد وغيره: أنها تدنيه من فوق رأسها فلا تظهر إلا عينها ومن جنسه النقاب: فكن النساء ينتقبن.

ابن تيميه دەفەرمووێت: جلباب ئەو پۆشاکەیە کەئافرەت لەبەری دەکات و لاشەی پێ دادە پۆشێت- عابا-، کە ابن مسعود و غەیری ئەویش پێی دەڵێن رداء و مەبەستیان لەمەیە، وە خەڵکی ئاسایی پێی دەڵێن الإزار، کە وەک عابایە و ئافرەت سەری و لاشەی هەمووی پێ دادەپۆشێت.

أبو عبيد و غەیری ئەویش ووتوویانە: لەسەریەوە پۆشاکەکە دەکات کە تەنها چاوی دەربکەوێت وەک هەمان شێوەی نیقاب، ئافرەتانی هاوەڵان نیقابیان دەپۆشی[١].

والخمار : ما تخمر به المرأة رأسها ووجهها، وعن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالت: "إنما الخمار ما وارى الشعر والبشر" وما فيها قال النابغة:

لەوشەی تخمیرەوە هاتووە واتە داپۆشین، لەفەرموودەش هاتووە «ولا تخمروا وجهه ولا رأسه»، واتە «ڕووخساری و سەری -مردووەکە- دامەپۆشن»[٢]

- **الخمار:**

وە خیمار: ئەو پۆشاکەیە کە ئافرەت سەری و دەمووچاوی پێ دادە پۆشێت، عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: «إنما الخمار ما وارى الشعر والبشر » «خیمار ئەوەیە کە قژ و پێست داپپۆشێت»[٣]

وە پێشی دەوترێت: النصيف، وەک لەفەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

---

(١) عمدة الفقة لابن تيمية (١/ ٣٢٢)
(٢) سنن ابن ماجه (٣٠٨٤)
(٣) مصنف عبد الرزاق (٥٠٤٩)

دا هاتووە لەباسکردنی حور العین و دەفەرموویت: «ولنصیف إحداهن علی رأسها خیر من الدنیا وما فیها» واتە: « ئەو سەرپۆشەی - ئافرەتانی بەهەشت ( حور العین ) لەسەریانە باشتر و بەنرخترە لە دونیا ئەوەشی تیایدایە»

نابغەی شاعیریش وتویەتی :

*سقط النصیف ولم ترید اسقاطه          فتناولته واتقتنا بالید*

واتە :سەرپۆشەکەی کەوتە خوارەوە بەبێ وویستی خۆی ویستم بۆی هەڵگرمەوە بەدەستی دووری خستینەوە [١]

- **الجیب:**

جیب القمیص والدرع، والجمع جیوب، وأجیاب. وهو ما یدخل منه الرأس عند لبسه.وقیل: فلان ناصح الجیب: یعنی بذلك قلبه وصدره، أي أمین.

وعن سعید بن جبیر في قوله: ( جیوبهن ) یعنی النحر والصدر.

واتە ملی پۆشاک، وە کۆی ووشەکە جیوب و أجیاب ـە[٢]

ئەو بەشەیە کە سەری پێدا دەکرێت لەکاتی لەبەرکردنی پۆشاکدا[٣]

وە دەوترێت: فلاَن کەس ناصح الجیب ە واتە دڵ و سنگی پاکە و کەسێکی ئەمین و دەست پاکە[٤].

وە سعید بن جبیر دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (جیوبهنّ) فەرموویەتی : النحر والصدر واتە: مل و سنگ[٥].



(١) غریب الحدیث للقاسم بن سلام (٢/١٦٦)
(٢) لسان العرب (١/٢٨٨)
(٣) المعجم الوسیط (١/١٤٩)
(٤) لسان العرب (١/٢٨٨)
(٥) تفسیر ابن أبي حاتم (١٤٤٠٧)

دووەم

## ئایەتەکان

له پەرتوکی خوای گەورە - قورئان - دەربارەی واجب بوونی حیجاب :

### ئەو ئایەتانەی لە قورئانی پیرۆزدا بەڵگەن بۆ واجب بوونی بالاپۆشی

• **بەڵگەی یەکەم:** خوای گەورە فەرموویەتی : ( وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ) النُّور : ٣١

واتە: (بەئافرەتە بڕوادارەکانیش بڵێ: چاویان دانەوێنن لەئاست ئەو شتانەی عەورەتن و بۆیان حەلاڵ نییە تەماشای بکەن، داوێنیشیان لەو شتانە بپارێزن، کەخوا حەڕامیی کردوە و، جوانیی و ڕازاوەیی خۆیان بۆ پیاوانی بێگانە بەدەرنەخەن، بەڵکو دەبێ، ئەم زینەت و جوانیی و ڕازاوەییە بشارنەوە و بۆ پیاوی بێگانەی بەدەرنەخەن، مەگەر ئەو جل و پۆشاکانە نەبێ، کە بەدەردەکەوێ، گەر ئەو جل و پۆشاکە نەبێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی پیاو و مایەی گوناهـ و فیتنە، با سەرپۆشەکانیان بەسەر سینگیاندا بێننە خوارەوەو، ڕوخساریان دابپۆشن، تابەتەواوی دابپۆشرێن، ئەو زینە و جوانیی و ڕازاوەییە شاراوەییەی خۆیان بەدەرنەخەن، مەگەر تەنها بۆ مێردەکانیان بەدەربخەن، ئەوەی مێردەکانیان دەبینن، نابێ کەسانی دیکە بیبینن، جگە لەهەندێ لەو جوانیەی وەك ڕوخسار و گەردن و دەستەکان و قۆڵ و باسکەکان، کەئەوانە دروستن، باوکیان، یان خەزوریان، یان کوڕەکانیان، یان زڕ کوڕیان،

یان برایان، یان برازایان، یان خوشکەزایان، یان ئافرەتە موسڵمانەکان، نەك کافرەکان، یان کۆیلەکان، یان ئەو پیاوانەی ئارەزوی ئافرەتانیان نەماوە و پێویستیان بەئافرەتان نییە وەک ئەو گێلانەی، کە تەنها بۆ خواردن و خواردنەوە خزمەتکاری کەسانی دیکە دەکەن، یان ئەو منداڵە بچوکانەی، کەبەمەسەلەی کاروباری جنسی ئافرەتان نازانن و زانیاریان نییە و، هێشتا ئارەزویان تێدا دروست نەبوە و جنسیان ناجوڵێ، بیبینن، با ئافرەتان لەکاتی ڕۆیشتندا پێیەکانیان بەزەویدا دانەدەن، کەبەهۆیەوە ئەو پاوان و خڵخاڵ و هاوشێوەیان، کەجوانیەکە شارراوەتەوە، دەنگیان دەبیستریٚ و (کار لەدەرونی پیاوان دەکات و سەرنجیان ڕادەکێشێت). ئەی بڕواداران! بگەڕێنەوە بۆ تاعەتی خوا، بۆ ئەو سیفەتە جوان و ڕەوشتە پەسندانەی، کەخوا فەرمانی پێکردون و واز لەو ڕەوشت و ئاکار و سیفەتە ناپەسندانەی خەڵکانی نەفام و نەزان بێنن، بەو ئومێدەی، چاکەی دنیا و قیامەت ببەنەوە.)

عن عروة، عن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ، قالت: " يرحم الله نساء المهاجرات الأول، لما أنزل الله: ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ )، شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا.

وفي رواية: "شققن أكنف - قال ابن صالح: أكثف - مروطهن، فاختمرن بها ".

عروة لە عائشةوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: « ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتانی کۆچبەرانی سەرەتا بێت، کاتێک فەرمایشتی خوای گەورە دابەزی ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ) لە-دامێنی و بەشی درێژی- جلەکانیان بڕیو دەم و چاویان پێ داپۆشی»[١]

لەڕیوایەتێکی تردا:«لە ئەستورترین جلەکانیان بڕی و دەموو چاویان پێ داپۆشی» [٢]

وعن صفية بنت شيبة قالت: بينما نحن عند عائشة قالت: وذكرت نساء قريش وفضلهن، فقالت عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : "إن لنساء قريش لفضلا، وإني والله ما رأيت أفضل من نساء الأنصار أشد تصديقا بكتاب الله، ولا إيمانا بالتنزيل

(١) صحيح البخاري (٤٧٥٨)

(٢) سنن أبي داود (٤/٦١)، تفسير الطبري (١٧/٢٦٢)

لقد أنزلت سورة النور: (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ) انقلب رجالهن إليهن، يتلون عليهن ما أنزل إليهن فيها، ويتلوا الرجل على امرأته وابنته وأخته، وعلى كل ذي قرابته، ما منهن امرأة إلا قامت إلى مرطها المرحل فاعتجرت به، تصديقا وإيمانا بما أنزل الله من كتابه، فأصبحن يصلين وراء رسول الله ' الصبح معتجرات كأن على رؤسهن الغربان".

صفية بنت شيبة دەگێڕێتەوە: لەلای عائيشە ڕەزای خوای لێبێت دانیشتبووین، باسی ئافرەتانی قوڕەیش و فەزڵی ئەوانی دەکرد، فەرمووی: ئافرەتانی قوڕەیش بەڕێزن، بەڵام واللّه لەئافرەتانی پشتیوانان ، ملکەچترم نەبینیووە بۆ فەرمایشتەکانی خوای گەورە وە بۆ باوەڕ بوونیان بەوەی لەلایەن خوای گەورە دابەزیووە -کە قورئانە-، سورەتی النور دابەزی ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ) پیاوەکانیان گەڕانەوە بۆلایان، ئەوەیان بۆ بگێڕنەوە کەدابەزیووە دەربارەیان- دەربارەی پۆشاکی ئافرەتان-، پیاوەکە بەسەر ژنەکەی و کچەکەی و خوشکەکانیدا دەیخوێندەوە وە بەسەر هەر کەسێک خزمی بوایە، هیچ ئافرەتێکیان نەبوو ئیلا هەستاوە لەو جلانەی کە لەبەری ناکا بڕیوویەتی و کردوویەتی بە سەرپۆش بەسەریەوە و دەمووچاویان پێ داپۆشیووە، بەهۆی ئیمانیان و باوەڕیان بەوەی خوای گەورە لە کتێبەکەی دایبەزاندووە، هەتاوەکو لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانیان دەکرد بەو پۆشاکەوە، بەشێوەیەک دەبوون قەلەڕەش لەسەر سەریان دەوەستا- نەیدەزانی و نەیان دەبینی ئەمە مرۆڤە و هێندە داپۆشراو بوون »[١]

عن صفية بنت شيبة، عن أم سلمة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ، قالت: " لما نزلت: ( يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ) (الأحزاب: ٥٩)، خرج نساء الأنصار كأن على رءوسهن الغربان من الأكسية ".

صفية بنت شيبة دەگێڕێتەوە لە أم سلمة ڕەزای خوای لێبێت کە

(١) تفسير ابن أبي حاتم (١٤٤٠٦)

دەفەرمووێت: « کاتێک فەرمایشتی ( يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ) دابەزی، ئافرەتانی پشتیوانان دە هاتنە دەرەوە وەک بڵێی قەلە ڕەش بەسەریانەوە لەبەر ئەو پۆشاکەی لەبەریاندایە»[١]

عن سعيد بن جبير في قول الله: ( وَلْيَضْرِبْنَ ) يعني: وليشددن.

سعيد بن جبير دەفەرمووێت لەفەرمایشتی ( وَلْيَضْرِبْنَ ) : با توند دایپۆشن[٢]

وعن عطاء عن سعيد بن جبير في قول الله: ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ) يعنى: النحر والصدر ولا يرى منه شي. وروي عن مقاتل بن حيان أنه قال: على صدورهن.

عطاء لە سعيد بن جبيرەوە دەگێڕێتەوە لەفەرمایشتی خوای گەورە ( وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ) واتە: مل- گەردن- و سنگیان دابپۆشن و هیچ شتێکی لێوە دیار نەبێت. وە لە مقاتل بن حيان دەگێڕدرێتەوە فەرموویەتی: وە سنگیانی پێ دابپۆشن[٣].

**فائیدە و سوودێک:**

- خێرایی ملکەچی و جێبەجێ کردنی ئافرەتانی هاوەڵان بۆ فەرمایشتەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ.
- جوان جێبەجێکردنیان بۆ فەرمایشتەکان، چونکە چوون کام پۆشاکەیان ئەستوورە توند بەستیان بەسەریانەوە و ڕووخساریان پێ داپۆشی.

## سیفەتەکانی پۆشاکی شەرعی

١) پێویستو ئەستور بێت قورس بێت کە هیچ لەژێرەوە دەرنەخات، وەک چۆن عائشە ڕەزای خوای لێبێت باسی کردبوو.

٢) لەسەریەوە توند بکرێت نەک پارچەیەکی شلبێتەوە بکەوێتە خوار ، وە تەفسیرەکەی ابن عباس دێت لە دوایدا کە فەرموویەتی: «وإدناء

---

(١) سنن أبي داود (٤١٠١)

(٢) تفسير ابن أبي حاتم (١٤٤٠٤)

(٣) تفسير ابن أبي حاتم (١٤٤٠٧)

الجلباب أن تقنع وتشد على جبينها »

«وە پۆشینی الجلباب ئەوەیە کە دەمووچاوی پێ دابپۆشێت و لەناوچەوانی توندی بکات.

٣) دەبێت پان بێت و لاشەی هەمووی دابپۆشێت، ڕووخساری و مل و گەردنی دابپۆشێت لەسەریەوە بیپۆشێت تەنها چاوی دیار بێت، وەک چۆن عبیدة السلماني بەڕەحمەت بێت باسی کردووە و ان شاء اللّٰه باسی دەکەین.

٤) دەبێت پان و پۆڕ بێت کە هیچ لاشەی دەرنەخات، وەک لە ئەثەرەکاندا دێت لە پێشەوا عومەر و ئەسما و عائیشەوە ڕەزای خوایان لێبێت

٥) پێویستە لەجل و بەرگی پیاوان نەچێت، أم سلمة فەرموویەتی:

أن النبي ﷺ دخل عليها وهي تختمر، فقال: «لية لا ليتين».

پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلای و خیماری دەکرد، فەرمووی: «لية لا ليتين» ئەبوداود فەرمووی واتە: با وەکو جامانەی پیاوان نەبێت دوو جار بیهێنێتەوە بەسەر یەکا[١].وە لەفزەکە هی ئەوە.

وە ئافرەت پۆشاکەکەی و سەرپۆشەکەی نەکاتە سەر شانی وەک پیاوان و هاوشێوەیان نەبێت، بەڵکو لەسەریەوە دایبنێت-وشانی دابپۆشێت-.

هاتووە لەفەرموودەکەی ابن عباس ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: «لعن رسول اللّٰه ﷺ المتشبهين من الرجال بالنساء، والمتشبهات من النساء بالرجال»

«پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە کە خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەت و نەفرەتی لەو ئافرەتانەش کردووە کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان»[٢]

٦) پۆشاکەکە بۆن خۆش نەکرێت بە بۆن و بخور یاخود بە بۆنی پاکژکەرەوەی بۆندار- کە بمێنێتەوە-.

---

(١) رواه أحمد (٢٦٥٢٢) وأبو داود (٤١١٥)
(٢) رواه البخاري (٥٨٨٥)

لەسەردەمی عومەری کوڕی خەطاب ڕەزای خوای لێبێت ئافرەتێک هاتبووە دەرەوە لەماڵەکەی و خۆی بۆن خۆش کردبوو، بەلای عومەردا ڕۆشت و عومەر بۆنەکەی بۆهات، گۆچاکەنەی دەستی بەرز کردەوە پێیدا بکێشێت و فەرمووی: " تخرجن متطيبات، فيجد الرجال ريحكن، وإنما قلوب الرجال عند أنوفهم، اخرجن تفلات "

« بۆن لەخۆتان دەدەن کە دێنە دەرەوە لەماڵەکانتان ئەوکات پیاو بۆنەکەی ئێوەی بۆ بێت،وە دڵی پیاو لە لووتیدایە، بەبێ بۆن بچنە دەرەوە لەماڵەکانتان»[١]

وە بوسری کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزانی ابن مسعودی فەرمووە: « إذا أرادت إحداكن أن تشهد العشاء، فلا تمس طيبا »

«ئەگەر یەکێک لە ئێوەی ئافرەتان ویستی ئامادەی نوێژی عیشا بێت لە مزگەوت، با بۆن لەخۆی نەدات»[٢]

أبو الزعراء دەگێڕێتەوە: ابن مسعود فەرموویەتی:

«لأن أزاحم جملا قد هنئ قطرانا أحب إلي من أن أزاحم امرأة متعطرة»

«ئەگەر لەلای حوشترێکەوە بڕۆم کە هەموو لاشەی قیر بێت لام خۆشترە وەک لەلای ئافرەتێکەوە بڕۆم کە بۆنی لەخۆی داوە»[٣]

ئەعمەش دەگێڕێتەوە:

«استأذنت إبراهيم امرأته أن تأتي بعض أهلها، فأذن لها، فلما خرجت، وجد منها ريحا طيبة، فقال: " ارجعي إن المرأة إذا تطيبت، ثم خرجت فإنما هو نار، وشنار»

خێزانی إبراهیمی کوڕی ئەدهەم ئیزنی لە إبراهیم وەرگرت بۆ ئەوەی بچێت بۆ ماڵی خێزانەکەی، ئەویش ڕێگەی پێدا، کاتێک ئافرەتەکە خۆی حازر کرد

---

(١) مصنف عبد الرزاق (٨١٠٧)
(٢) مصنف عبد الرزاق (٨١١٢)
(٣) مصنف عبد الرزاق (٨١١٤)

و هاتە دەرەوە بۆنی خۆشی لێهات، پێی ووت: «بگەڕێرەوە ئافرەت ئەگەر خۆی بۆن خۆش بکات ئەوە ئاگر و خراپەیە بۆی»[١]

٧) پێویستە پۆشاکەکە پۆشاکی ناو بانگ نەبێت، لە ابن عمرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

« من لبس ثوب شهرة ألبسه الله يوم القيامة ثوبا مثله» زاد عن أبي عوانة «ثم تلهب فيه النار»

«هەر کەس پۆشاکێک بۆ ناو بانگ لەبەر بکات لەڕۆژی دوایدا خوای گەورە بەهەمان شێوە پۆشاکی ناوبانگی لەبەر دەکات- بۆ ئەوەی لای خەڵکی بناسرێت و بزانرێت کە تاوان بووە-»

أبي عوانة زیادەیەکی لەسەر ڕیواتەکە فەرمووە کە «دواتر بەئاگری دۆزەخ دەسوتێنرێت»[٢]

وە ابن قدامة لەباسی چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ نوێژی جەژن فەرموویەتی: غير متطيبات ولا يلبسن ثوب شهرة ولا زينة، ويخرجن في ثياب البذلة؛ لقول رسول الله ’: «وليخرجن تفلات». ولا يخالطن الرجال، بل يكن ناحية منهم.

بۆن لەخۆیان نەدەن وە پۆشاکی سەرنج ڕاکێش نەکەن بۆ ناسراو بوون وە زینەی تێدا نەبێت، وە پۆشاکەکە پۆشاکی ئیش کردن نەبێت، لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: «وليخرجن تفلات»، وە تێکەڵاو پیاوان نەبن، بەڵکو لەلایەکی تری ئەوان بن[٣].

٨) نابێت پۆشاکەکە خۆی لەخۆیدا زینە و سەرنج ڕاکێش بێت عائیشە و أم سلمة ڕەزای خوایان لێبێت پۆشاکەکەی بەری ئافرەتانیان لەڕەشیدا چواندووە بە قەلەڕەش.

وە فەرمایشتی خوای گەورە : (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) دەبێت هیچ زینە و جوانیەک دەرنەخەن بۆ بێگانە ئیلا شتێک نەبێت کە ناتواندرێت

---

(١) مصنف عبد الرزاق (٨١١٦)

(٢) سنن أبي داود (٤٠٢٩)

(٣) المغني لابن قدامة (٢٣٢)

بشارێتەوە.

ابن مسعود فەرموویەتی:

كالرداء والثياب يعني على ما كان يتعاطاه نساء العرب من المقنعة التي تجلل ثيابها وما يبدو من أسافل الثياب "

وەک پۆشاک و عابا کە ئافرەتانی عەرەب دەیان پۆشی وەک ئەو ئافرەتانەی ڕووخسار و لاشەیان بەپۆشاکەکانیان دادەپۆشی وە خوارو پۆشاکەکانیان دەردەکەوت، وە حەسەن و ئیبن سیرین و ئەبو جەزا و إبراهیمی نەخەعیش هەمان ڕایان هەبووە [١]

ابن مسعود دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە: (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) فەرمووی:

الزينة: السوار والدملج والخلخال والقرط والقلادة .

(إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) قال: الثياب والجلباب.

زینە بازن و مستیلە و پاوانە و گوارەو ملوانکەیە، (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) فەرمووی: پۆشاک و جلبابە.

وە دەفەرمووێت: الزينة زينتان. زينة ظاهرة، وزينة باطنة لا يراها إلا الزوج.

فأما الزينة الظاهرة: فالثياب، وأما الزينة الباطنة: فالكحل والسوار والخاتم.

زینەت دوو جۆرە، زینەتێک کە ئاشکرایە و زینەتێک داپۆشراوە کە تەنها هاوسەر دەیبینێت.

جا زینەتی ئاشکرا: پۆشاکە، وە زینەتی داپۆشراو: کلی چاو و بازن و مستیلەیە[٢].

ئافرەت کە دەرچوو لەماڵەوە ڕێگەی پێ نەدراوە زینەت و جوانی دەربخات، یاخود سەرنجی کەس ڕابکێشێت و ئاگاداری بکاتەوە بەو زینە و جوانیەی لە ژێرەوە هەیە، (وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ) پیاکێشانی

---

(١) ( تفسير ابن كثير : ٦ / ٤١ )

(٢) الدر المنثور (١٧٩/٦)

قاچی بەزەویدا بۆ ئەوەی دەنگی ئەو زینەتە بێت کە بەخۆوەیەتی ببیسترێت دروست نیە، وە گومانی تێدا نیە لابردنی نیقاب و سەرپۆش قورسترە لە بۆن خۆشکردن ولە دەر خستنی هەندێک زینەتی.

لیث دەگێڕێتەوە: أن امرأة خرجت متزينة أذن لها زوجها، فأخبر بها عمر بن الخطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فطلبها فلم يقدر عليها فقام خطيبا، فقال: هذه الخارجة، وهذا لمرسلها لو قدرت عليهما لشترت بهما، ثم قال: "تخرج المرأة إلى أبيها يكيد بنفسه وإلى أخيها يكيد بنفسه، فإذا خرجت فلتلبس معاوزها، فإذا رجعت فلتأخذ زينتها في بيتها، ولتتزين لزوجها"

قال عبد الرزاق: يعني شترت سمّعت بهما، والمعاوز خلق الثياب

ئافرەتێک خۆی ڕازاندەوە و چووە دەرەوە و مێردەکەی ڕێگەی پێدابوو بچێتە دەر،

دواتر مێردەکەی بۆ پێشەوا عومەری کوڕی خەطابی ڕەزای خوای لێ بێت باسکرد، ناردنی بەدوایدا نەیان توانی بیهێنن، پێشەوا عومەر وتاری دا و فەرمووی :

ئەو ئافرەتەی چوەتە دەر و ئەو پیاوەش کە ڕێگەی داوە ئاوا بچێتە دەر ئەگەر دەستم پێیان بگات و بیانهێننە لام قسەی ناخۆشم زۆر پێدەوتن، پاشان فەرمووی :

ئافرەت دەچیتە دەر بۆلای باوکی یا براکەی لەبەر پێویستیەکی زۆر، کاتێکیش دەچێتە دەر لە ماڵەکەی با پۆشاکێکی کۆن لەبەر بکات و کە گەڕایەوە ماڵەوە لەناو ماڵی خۆی خۆی بڕازێنێتەوە وخۆی بۆ مێردەکەی جوان بکات»[١]

ابن عمر ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «ائذنوا للنساء بالليل إلى المسجد» قال ابنه: والله لا نأذن لهن فيتخذن ذلك دغلا قال: " فعل الله بك، تسمعني أقول: قال رسول الله '، وتقول أنت: لا؟

---

(١) مصنف عبد الرزاق (٨١١١)



«ڕێگە بەئافرەتان بدەن شەوان بچن بۆ مزگەوت»، کوڕێکی ابن عمر ووتی: واللّٰه ڕێگەیان نادەین بەهۆیەوە فێل دەکەن بۆ چوونە دەرەوە ، ابن عمر فەرمووی: خوای گەورە وا و وات لێبکات، گوێت لەمنە دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، تۆش ئەڵێیت نەخێر؟.

لیث لەفەرموودەکەی دەفەرمووێت: لیخرجن تفلات علیهن خلقان، شعثات بغیر دهن"

با بەبێ بۆن بچنە دەرەوە جلی کۆنیان لەبەر بکەن- بۆ ئەوەی سەرنج ڕاکێش نەبێت و بۆنی پێوە نەبێت- [١]



(١) مصنف عبد الرزاق (٥١٠٨)

• **بەڵگەی دووەم:** ( وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ) (النور: ٦٠)

وە ئەو ئافرەتە پیرانەی (پیرێژنانەی) کە لە سووڕی مانگانەو لە منداڵ بوون بوونەتەوەو ئومێد و ئارەزووی شووکردنیان نییە لەبەر گەورەیی تەمەنیان، ئەمانە تاوانبار نابن ئەگەر پۆشاکەکانیان دابنێن، واتە: نیقاب نەکەن ئاساییە، بەڵام نابێت جوانی خۆیان یان عەورەتی خۆیان دەربخەن، یان خۆیان بڕازێننەوە بۆ پیاوانی نامەحرەم، وە ئەم پیرەژنانەش هێشتا ئەگەر عابا بکەن و حیجاب بکەن وە خۆیان داپۆشن ئەمە بۆیان باشترە، وە خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە .

ابن عباس دەفەرمووێت لەفەرمایشتی (وَالقَواعِدُ مِنَ النِّساءِ اللّاتي لا يَرجونَ نِكاحًا):

هي المرأة لا جناح عليها أن تجلس في بيتها بدرع وخمار وتضع عنها الجلباب، ما لم تتبرج لما يكرهه الله، وهو قوله: ( فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ) ثم قال ( وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ )

ئەو ئافرەتە بەتەمەنەیە کە گوناهبار نابێت لەماڵەکەی خۆی دابنیشێت بە سەرپۆش و پۆشاکەکەیەوە، وە نیقاب نەکات، بەڵام خۆی نەڕازێنێتووە -ئەگەر نامەحرەمی لێ بوو لەماڵەکە- بەشتێک خوای گەورە پێی ڕازی نەبێت، ئەوەش فەرمایشتی (فَلَيسَ عَلَيهِنَّ جُناحٌ أَن يَضَعنَ ثِيابَهُنَّ غَيرَ مُتَبَرِّجاتٍ بِزينَة)، دواتر فەرمووی: (وَأَن يَستَعفِفنَ خَيرٌ لَهُنَّ)[1].

عن عاصم الأحول قال : كنا ندخل على حفصة بنت سيرين، وقد جعلت الجلباب هكذا، وتنقبت به. فنقول لها: رحمك الله، قال الله تعالى:( وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ

(١) السنن الكبرى للبيهقي (٧/١٥٠)

ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ) هو الجلباب. قال فتقول لنا: أي شيء بعد ذلك؟ فنقول: (وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ) فتقـــول: " هو إثبات الجلباب".

عاصم الأحول دەڵێت: ئێمە دەچووین بۆلای حفصةی کچی سیرین، بەپۆشاکەکەی نیقابی کردبوو، ئێمەش پێمان دەووت: ڕەحمەتی خوات لێبێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ( وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ) مەبەست پێی نیقابە، ئەویش پێی دەووتین: ئایەتەکە دوای ئەوە چی دەڵێت ؟ ئێمەش دەمان ووت: (وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ)، ئەویش دەیفەرموو: ئەوە جێگیر کردنی نیقابە[1].

وە دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ) الضحاك فەرموویەتی : يعني الجلباب، وهو القناع، وهذا للكبيرة التي قد قعدت عن الولد، فلا يضرّها أن لاتجلبب فوق الخمار.

وأما كلّ امرأة مسلمة حرّة، فعليها إذا بلغت المحيض أن تدني الجلباب على الخمار، وقال الله في سورة الأحزاب: (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ).

واتە جلباب واتە نیقاب، ئەم ئایەتەش بۆ ئەو ئافرەتە گەورە و بەساڵاچوانەن کە مناڵیان نابێت، کە تاوانبار نابێت نیقاب نەکات لەسەر سەرپۆشەکەی.

بەڵام هەموو ئافرەتێکی موسوڵمان ئەگەر گەیشت بەتەمەن و کاتی تووشبوونی بە سوڕی مانگانە ئەوە واجبە لەسەری کە نیقاب بکات بەسەر سەرپۆشەکەیدا، خوای گەورە لەسورەتی الأحزاب دەفەرمووێت: (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ) سورة الأحزاب:٥٩

«با جلباب -نیقاب- و لەچك و پۆشاکەکانیان شۆڕ بکەنەوە تا لاشەیان دابپۆشێت، ئەمە نزیکترە لەوەی کە بناسرێنەوە، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی ئەوەی ئافرەتی ئازاد بوایە بەو شێوازە خۆی دائەپۆشی، وە ئەوەی کەنیزەك و داوێن پیس بوایە خۆی دانەئەپۆشی بۆیە ئەیانزانی کە ئەمە ئافرەتی

---

(١) السنن الكبرى للبيهقي (١٥٠/٧)



ئازادەو لەلایەن کەسانی خراپەوە ئازار نەئەدران»[١].

دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (وَأَن يَستَعفِفنَ خَيرٌ لَهُنَّ)

عطية فەرموویەتی: يُدِمْنَ القناع خير لهن..

بەردەوام بن لە ڕوو پۆش لەسەر کردن باشترە بۆیان- مەبەست لەئایەتەکە ئافرەتە بەتەمەنەکانە کە چیتر تووشی سوڕی مانگانە نابن و خواست نیە لەویستنیان-.

وە مجاهد فەرموویەتی: أي: يلبسن جلابيبهن.

جلبابەکانیان لەبەر کەن -لاشە و ڕووخساریان دابپۆشن-.

وە سعیدی کوڕی جوبەیر فەرموویەتی: وأن لايضعن الجلباب من فوق الخمار عند غير ذي محرم، خير لهن من أن يضعنه.

ڕووپۆشەکانیان کە بەسەر سەرپۆشەکانیان دەیکەن لاینەبەن لای نا مەحرەمەکان باشترە بۆیان وەک لەوەی لاییبەن.

حسن و قتادە دەفەرموون: يلبسن الجلباب أفضل من وضعهن إياه.

ڕوو پۆشەکان لەسەر بکەن باشترە لەوەی لایبدەن[٢].

وە دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (غَيرَ مُتَبَرِّجاتٍ بِزينَةٍ)

أم ضياء دەگێڕێتەوە: کە چووەتە ژوور بۆلای عائشە ڕەزای خوای لێبێت، ووتم: يا أم المؤمنين ما تقولين في الخضاب، والنفاض، والصباغ، والقرطين، والخلخال، وخاتم الذهب وثياب الرقاق؟

فقالت: " يا معشر النساء قِصَّتُكُنَّ كلها واحدة، أحل الله لكن الزينة غير متبرجات، أي: لا يحل لكنَّ أن يَروا مِنْكُنَّ مُحَرَّمًا ".

ئەی دایکی ئیمانداران چی دەڵێیت دەربارەی خەنە کردن و نفاض-جۆرێکە لەپۆشاک- و ڕەنگ کردنی پۆشاک و گوارە و پاوانە و مستیلەی ئاڵتون وە جل و بەرگی تەنک؟

---

(١) تفسير الطبري (١٩/٢١٦)

(٢) تفسير بن أبي حاتم (١٤٨٥٣و ١٤٨٥٤ و١٤٨٥٥ و ١٤٨٥٦)

فەرمووی: «ئەی ئافرەتان باسی ئێوە یەک شتە، خوای گەورە زینەت و جوانی بۆ حەلاڵ کردوون بەو مەرجەی کە نامەحرەمتان نەتان بینێت بەو شێوەیە»

وە حسن و قتادە دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (غَيرَ مُتَبَرِّجاتٍ بِزِينَة) دەفەرموون: باديات، عن النحر ونحو ذلك.

دەرخەر نەبن، وەک دەرخستنت ملیان و غەیری ئەوەش.

وە سعيد بن جبير فەرموویەتی: تتبرجن بوضع الجلباب أن يُرى ما عليها من الزينة.

ڕوو پۆشەکان و سەرپۆش وپۆشاکەکانیان لانەبەن تا زینەت و جوانیەکانیان دەربکەوێت[١].

وە ابن زيد فەرموویەتی دەربارەی فەرمایشتی خوای گەوەو(وَأَن يَستَعفِفنَ خَيرٌ لَهُنَّ):

والاستعفاف: لبس الخمار على رأسه.

استعفاف بریتیە لە پۆشینی سەرپۆش لەسەریەوە[٢].

**سوودێک:**

خوای گەورە ڕێگەی داوە بە ئافرەتە بەتەمەن و بەساڵاچووەکان کە ڕووخساریان دەربخەن، بەمەش بەڵگەکە دەریدەخات دروست نیە بۆ غەیری ئەمانە لەئافرەتان ڕووخساریان دەربخەن سەرەڕای ئەوەشی ڕێگەی بەوان داوە فەرمووشیەتی (وَأَن يَستَعفِفنَ خَيرٌ لَهُنَّ).

محمد بن ابراهيم فەرموویەتی: وإذا كان العجائز يمنعن من التبرج بالزينة، فهو في الشابات أشد منعاً؛ والفتنة بسببهن أكبر.

ئەگەر ئافرەتانی بەتەمەن و بەساڵاچوو ڕێگە نەدرێن جوانی دەربخەن، ئەوە لە ئافرەتە گەنجەکان زیاتر جەختی لەسەرە کە نەکرێت وفیتنەش بەهۆی ئەوانەوە زیاترە[٣].

---

(١) تفسير ابن أبي حاتم (١٤٨٥١،١٤٨٥٠،١٤٨٤٩)

(٢) تفسير الطبري ( ١٩ / ٢١٨ )

(٣) الدرر السنية ( ١٥ / ١٠٧)

وقال ابن تيمية : كشف النساء وجوههن بحيث يراهن الأجانب غير جائز، وعلى ولي الأمرِ الأمرَ بالمعروف، والنهيِ عن هذا المنكر، وغيره، ومن لم يرتدع فإنه يعاقب على ذلك بما يزجره.

ابن تيميه فەرموویەتی : دروست نیە ئافرەتان ڕووخساری خۆیان دەربخەن بۆ نامەحرەمەکانیان، وە واجبە لەسەر لێپرسراوانی ئافرەتەکە ( وەلی ئەمری ئافرەتەکە) فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لەم تاوانە و غەیری ئەمیش ، جا گەر کەسێک سەرپێچی بکات سزای بدرێت بەو ئاستەی پێی بترسێت و بگەڕێتەوە[١].





(١) الفتاى الكبرى لابن تيمية ( ٣ / ٧٢)

• **بەڵگەی سێیەم:** (يا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِأَزواجِكَ وَبَناتِكَ وَنِساءِ المُؤمِنينَ يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ ذلِكَ أَدنى أَن يُعرَفنَ فَلا يُؤذَينَ وَكانَ اللَّهُ غَفورًا رَحيمًا) سورة الأحزاب ٥٩

عن مجاهد: (يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) يقول: يتجلببن حتى يعلم أنهن حرائر، لا يعرض لهن فاسق بأذى من قول أو ريبة.

مجاهد دەفەرموویت: (يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ)

واتە لاشەو ڕووخساریان داپۆشن تا بزانرێت ئەم ئافرەتانە ئازادن و کۆیلە نین، تا کەسی خراپ و فاسق ئازاریان نەدەن نە بەقسە نە کردار[١].

عن ابن عباس رضي الله، عنهما في هذه الآية قال: " أمر الله نساء المؤمنين إذا خرجن من بيوتهن في حاجة أن يغطين وجوههن من فوق رؤوسهن بالجلابيب، يبدين عينا واحدة".

ابن عباس دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموویت: خوای گەورە فەرمانی بەئافرەتانی ئیماندار کردووە کە چوونە دەر لەماڵەکانیان لەبەر پێویستیەک ئەوە با ڕووخساریان داپۆشن و لەسەر سەریانەوە و -سەریشیان داپۆشن- بەجلباب، وە تەنها یەک چاویان دیار بێت.

وعن ابن عباس أيضا أنه قال: كانت الحرة تلبس لباس الأمة، فأمر الله نساء المؤمنين أن يدنين عليهن من جلابيبهن؛ وإدناء الجلباب: أن تقنع وتشد على جبينها.

وە ابن عباس دەفەرموویت: ئافرەتانی ئازاد وەک پۆشاکی ئافرەتانی کۆیلەیان لەبەردەکرد، خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئافرەتانی ئیماندار کە بە جلبابەکانیان ڕووخساریان داپۆشن و بیبەستن لەناو چەوانیان[٢].

وعن محمد بن سيرين قال: سألت عبيدة ، عن هذه الآية (يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) فرفع ملحفة كانت عليه فقنع بها، وغطى رأسه كله حتى بلغ

---

(١) تفسير مجاهد (١/٥٥٢)

(٢) تفسير الطبري ( ١٩ / ١٨١ )



الحاجبين، وغطى وجهه وأخرج عينه اليسرى من شق وجهه والأيسر مما يلي العين.

وە محمد بن سيرين دەفەرمووێت: پرسیارم لە عبيدة كرد دەربارەی ئەم ئایەتە: (يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) ئەويش قوماشێكی بەرزكردەوە كە پێوەی بوو و دەمووچاوی پێ داپۆشی، وە سەری هەمووی پێ داپۆشی تا برۆكانیشی داپۆشی، وە ڕووخساری پێی داپۆشی وە چاوی چەپی دەرخست لێوەی[١]

وعن ابن علية، عن ابن عون، عن محمد، عن عبيدة، في قوله: (يا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِأَزواجِكَ وَبَناتِكَ وَنِساءِ المُؤمِنينَ يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) الأحزاب ٥٩

قال ابن علية: فلبسها عندنا ابن عون،

قال: ولبسها عندنا محمد ، قال محمد: ولبسها عندي عبيدة.

قال ابن عون بردائه، فتقنع به، فغطى أنفه وعينه اليسرى، وأخرج عينه اليمنى، وأدنى رداءه من فوق حتى جعله قريبا من حاجبه أو على الحاجب

ابن عليه دەگێڕێتەوە لە ابن عونەوە ئەويش دەگێڕێتەوە لەمحمد و ئەويش لە عبيدة دەربارەی فەرمايشتی خوای گەورە (يا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِأَزواجِكَ وَبَناتِكَ وَنِساءِ المُؤمِنينَ يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) الأحزاب ٥٩

ابن عليه دەفەرمووێت: ابن عون پۆشاكێكی لەبەر كرد و پيشانی داين مەبەستی ئایەتە چۆنە

وە ابن عون فەرمووی: محمد هەمان كاری كردووە بۆمان و پيشانی داين ,
وە محمد فەرمووی: عبيدة هەمان كاری كردووە بۆم و پيشانی دام.

ابن عون پۆشاكەكەی هێنا و دەمووچاوی پێ داپۆشی، لوت و چاوی چەپيشی پێ داپۆشی و چاوی ڕاستی دەرخست، وە لەسەریشیەوە سەری هەمووی داپۆشی و تا لای برۆكانی پێی داپۆشی[٢].

(١) تفسير ابن أبي حاتم ( ١٧٧٨٣، ١٧٧٨٧)
(٢) تفسير الطبري ( ١٩ / ١٨١ )

**سوودێک:**

• واجبە داپۆشینی ڕووخسار بۆ هەموو ئافرەتێکی موسوڵمانی ئازاد، جا خۆ گەر واجب نەبوایە ئاوا زانایانی فەرمووده ئاوا گرنگیان نەدەدا بە چۆنیەتی ئەو داپۆشینەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، کە هەر ڕاویەک لە ڕاویەکەی تر دانە بەدانە گێڕاویانەتەوە.

• زانایانی فەرمووده و ئەهلی ڕەئی و هەموو ئەهلی بیدەعیش کە خۆیان پاڵدەدەنە ئیسلام و خۆیان بە مقسوڵمان دەزان لە هەموو مێژووی ئیسلامدا کۆدەنگن لەسەر ئەوەی داپۆشینی ڕووخساری پاداشتی زیاترە لە دانەپۆشینی

• وە کۆدەنگن لەسەر تاوانباری و حەڕامیەتی ئەوەی ڕووخسار دەربخرێت کە زینەت و جوانکاری پێوەیە کە غەیری مەحرەمی خۆیان بیان بینێت، لەمەشدا تەنانەت رافضة و قرامطة ش هاودەنگن لەگەڵ ئەهلی ئیسلام.

جا هەر کەسێک پێچەوانەی ئەمانە بکات و تانە بدات لەوەی ئەمانە دەڵێت و ناویان ببات بە توند ڕەو، ئەوە دیارە دژایەتیەکەی لەگەڵ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ نەک لەگەڵ توندڕەوەکان.

• حیجاب پارێزەرە بۆ ئافرەت لە ئازاردانی دوو ڕوو و کەسانی خراپ و فاسق بۆیان، وە پارێزەرە لە داوێن پاکیان.

السدي لەفەرمایشتی (يُدنينَ عَلَيهِنَّ مِن جَلابيبِهِنَّ) فەرموویەتی:

كان أناس من فساق أهل المدينة بالليل حين يختلط الظلام، يأتون إلى طرق المدينة فيتعرضون للنساء، وكانت مساكن أهل المدينة ضيقة فإذا كان الليل خرج النساء إلى الطرق، فيقضين حاجتهن، فكان أولئك الفساق يتبعون ذلك منهن، فإذا رأوا امرأة عليها جلباب قالوا: هذه حرة فكفوا، عنها، وإذا رأوا المرأة ليس عليها جلباب قالوا: هذه أمة فوثبوا عليها.

کۆمەڵێک پیاوی خراپ و فاسق هەبوون لە مەدینە کاتێک کاتێک تاریکی شەو دەهات ، ئەچوونە گەڕەکەکان و ڕێگەیان دەگرت لە ئافرەتەکان بۆ کاری



خراپ، وە ماڵەکانی مەدینە بچووک بوون -شوێنی دەست بەئاو گەیاندنیان نەبوو- کاتێک شەو دەهات ئافرەتەکان دەچوونە دەرەوە تا دەست بەئاو بگەیەنن، ئەو پیاوە خراپ و فاسقانەش دوای ئافرەتەکان دەکەوتن، ئەگەر ئافرەتێکیان ببینیایە خۆی داپۆشیووە، ئەیان ووت: ئەوە ئافرەتێکی ئازادە و کۆیلە نیە، لێی دوور دەکەوتنەوە، ئەگەر ئافرەتێکیشیان ببینیایە خۆی دانەپۆشیووە-ڕووخساری-، دەیان ووت: ئەوە کۆیلەیە و دەچوون بۆی.

**• بەڵگەی چوارەم:** خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٥٣)

(ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە مەچن بۆ سەردانی ماڵەکان پێغەمبەر مەگەر مۆڵەتتان بدرێت و مۆڵەت بخوازن، (ئەگەر مۆڵەت دران بۆ نانخواردنێك) چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێنەگەیشتبوو (مەبەست ئەوەیە کە زوو مەچن کە هێشتا خواردنەکە پێنەگەیشتووە)، بەڵام بانگ کران ئەوە بچنە ژوورەوە، خۆتان بە گفتوگۆوە سەرگەرم مەکەن، چونکە ئەو کارەتان پێغەمبەر ئازار دەدات (هەرچەندە) شەرمتان لێدەکات و (داوای چوونە دەرەوەتان لێناکات، بێگومان) خوا شەرم لە (ڕاگەیاندنی) حەق و دروستی ناکات خۆ ئەگەر داوای شتێکی پێویستان (لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد) لە پشتی پەردەوە داوای لێبکەن، ئا ئەو جۆرە ڕەفتارە چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش، بێگومان هیچ کات بۆتان نیە ئازارو دڵتەنگی بۆ پێغەمبەری خوا پێش بێنن، هەرگز بۆتان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێك مارە بکەن چونکە ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیەو (زۆر نابەجێیە، چونکە ئەوان دایکتانن، دایکیش لە ڕۆڵەی حەرامە).)

ئەمە ئایەتی حیجابە، عن أنس رضي الله عنه ، قال: قال عمر رضي الله عنه، قلت: «يا رسول الله يدخل عليك البر والفاجر، فلو أمرت أمهات المؤمنين بالحجاب، فأنزل الله آية الحجاب».

پێشەوا ئەنەس دەگێڕێتەوە لە پێشەوا عومەرەوە کە فەرموویەتی: ووتم: «ئەی پێغەمبەری خوا -صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- هەموو کەس دێن بۆلات لەکەسی باش و خراپ، بۆ فەرمان بە دایکانی ئیمانداران ناکەیت کە حیجاب -ڕووخساریشیان

دابپۆشن- بکەن لەنێوان خۆیان و ئەواندا، جا خوای گەورە ئایەتی حیجابی دابەزاند»[١]

وأن عائشة رضي الله عنه زوج النبي ﷺ قالت: كان عمر بن الخطاب رضي الله يقول لرسول الله ﷺ : احجب نساءك، قالت: فلم يفعل، " وكان أزواج النبي ﷺ يخرجن ليلا إلى ليل قبل المناصع، فخرجت سودة بنت زمعة، وكانت امرأة طويلة، فرآها عمر بن الخطاب وهو في المجلس، فقال: عرفتك يا سودة، حرصا على أن ينزل الحجاب " قالت: «فأنزل الله عزوجل آية الحجاب»

وە عائشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عمری کوڕی خەطاب بە پێغەمبەری خوای دەوت ﷺ کە خێزانەکانت با حیجابیان هەبێت -لەنێوان ئەوان و خەڵکی-، ئەویش نەیکرد، وە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشەواندا دەچوونە دەر بۆ دەرەوە تا بچنە شوێنی دەست بەئاو گەیاندن -کە لەدەرەوەی ماڵەکانی مەدینە بوو-، شەوێک سودە کچی زمعە چووە دەرەوە و ئافرەتێکی بالاّ بەرز بوو، عمری کوڕی خەطاب لەناو مەجلیسدا بوو وبینی و ووتی: ناسیمیتەوە سودە، بۆ ئەوەی حیجاب دابەزێت بۆ سەریان، عائشە فەرمووی: خوای گەورە ئایەتی حیجابی دابەزاند[٢].

وعن ابن شهاب قال: أخبرني أنس رضي الله عنه ، أنه كان ابن عشر سنين مقدم رسول الله ﷺ المدينة، فكن أمهاتي يُوَطِّوَنَّنِي على خدمته، فخدمته عشر سنين، وتوفي وأنا ابن عشرين، فكنت أعلم الناس بشأن الحجاب، فكان أول ما نزل ما ابتنى رسول الله ﷺ بزينب بنت جحش، أصبح بها عروسا، فدعى القوم فأصابوا من الطعام، ثم خرجوا، وبقي رهط عند النبي ’، فأطالوا المكث، فقام فخرج وخرجت لكي يخرجوا، فمشى فمشيت معه، حتى جاء عتبة حجرة عائشة، ثم ظن أنهم خرجوا، فرجع ورجعت معه حتى دخل على زينب، فإذا هم جلوس، فرجع ورجعت حتى بلغ عتبة حجرة عائشة،

(١) صحيح البخاري(٤٧٩٠)
(٢) صحيح البخاري (٦٢٤٠)

وظن أنهم خرجوا، فرجع ورجعت معه، فإذا هم قد خرجوا، فضرب النبي ﷺ بيني وبينه الستر، وأنزل الحجاب.

ابن شهاب دەگێڕێتەوە کە ئەنەس پێی ووتم کە تەمەنی دە ساڵان بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، دایکانیشم هانیان دەدام بچم خزمەتی بکەم، منیش دە ساڵ خزمەتیم کرد ﷺ، کاتێک وەفاتی کرد تەمەنم بیست ساڵان بوو، جا من شارەزاترین کەس بووم دەربارەی حیجاب، کاتێک سەرەتا دابەزی کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ زینب ی کچی جحش ی گواستەوە، و لەلای مایەوە، شەوەکەی خەڵکی بانگ کرد و خواردنی پێدان، و کۆمەڵێک کە تەواو بوون هەستان ڕۆشتن و کۆمەڵێکیش مانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و زۆر دانیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا چووە دەرەوە و منیش لەگەڵی ڕۆشتم بۆ ئەوەی خەڵکەکەش هەستن و بڕۆنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت و منیش لەگەڵی دابووم تا گەیشتە لای خانووەکەی عائشە، دواتر هەستی کرد ڕۆشتبن گەڕایەوە بچێت بۆلای زینب ی خێزانی سەیری کرد خەڵکەکە هەر دانیشتوون و نەڕۆشتوون، دووبارە هەستا و منیش چووم لەگەڵی تا گەیشتینە لای دەرگای خانووەکەی عائشە، دواتر هەستی کرد ڕۆشتبن، گەڕایەوە و منیش لەگەڵی گەڕامەوە، سەیری کرد خەڵکەکە ڕۆشتوون- لەڕووی نەهات پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان بڵێت بڕۆن تا خۆیان ڕۆشتن-، ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی دا دایەوە لەنێوان من و خۆیدا کەئەو لەماڵەکەی بوو و ئایەتی حیجاب دابەزی[1].

عن أنس رضي الله عنه ، قال: «أقام النبي ﷺ بين خيبر والمدينة ثلاثا يبنى عليه بصفية بنت حيي، فدعوت المسلمين إلى وليمته فما كان فيها من خبز ولا لحم أمر بالأنطاع، فألقى فيها من التمر والأقط والسمن، فكانت وليمته»

(١) أدب المفرد للبخاري ، باب كيف نزلت آية الحجاب (١/ ٣٠٦ )

فقال المسلمون: إحدى أمهات المؤمنين، أو مما ملكت يمينه، فقالوا: إن حجبها فهي من أمهات المؤمنين، وإن لم يحجبها فهي مما ملكت يمينه .

«فلما ارتحل وطى لها خلفه، ومد الحجاب بينها وبين الناس»

ئەنەس دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ لەنێوان خیبر و مەدینە مایەوە، ئەوکاتەش صفية بنت حيي خێزانی گواستەوە، منیش موسوڵمانانم بانگێشت کرد بۆ ولیمەکەی، خواردنەکەش نان و گۆشتی تیا نەبوو، داوای کرد قاپ بهێندرێت هێنا و خورما وکەشک و ڕۆنی تێکرد و ئەوە وەلیمەکەی بوو ﷺ.

موسوڵمانان ووتیان: ئایا ئەبێت بە یەکێک لەدایکانی ئیمانداران یاخود لە جاریەکانی دەبێت، کۆمەڵێکی تر ووتیان: ئەگەر حیجاب دابنی لەبەینی ئەو و خەڵکیدا ئەوە لە دایکانی ئیماندارانە ئەگەریش داینەنێت ئەوە لە جاریەکانیە.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ کە وویستی بڕوات و بگەڕێتەوە لەپشتی خوای جێگەی بۆ دانا و حیجابی دروست کرد لەبەینی ئەو و خەڵکیدا»[١]

عن عروة، عن عائشة رضي الله عنه : أن أخا أبي القعيس استأذن على عائشة بعد آية الحجاب فأبت أن تأذن له، فذكر ذلك للنبي ﷺ فقال: «ائذني له فإنه عمك» فقلت: إنما أرضعتني المرأة ولم يرضعني الرجل، فقال: «إنه عمك، فليلج عليك».

عروە لەعائشەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە: کە برای أبو القعيس ئیزنی لەعائشە وەرگرت بچێتە ژوورەوە بۆلای دوای دابەزینی حیجاب، عائشەش ڕێگەی نەدا و ئیزنی نەدا، دواتر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺی باسکرد، ئەویش فەرمووی: «ڕێگەی بدە ئەو مامتە- بەهۆی شیرپێدان-»، منیش ووتم: ژن شیری پێداوم خۆ پیاو پێی نەداوم، ئەویش فەرمووی: « مامتە با بێتە ژوورەوە بۆلات»[٢]

---

(١) البخاري في الصحيح ( ٧ / ٦)
(٢) سنن النسائي (٣٣١٥)

**سوودێک:**

• خودای گەورە ڕێگەی داوە کە پرسیار لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێت کە پێویستیەک بێتە پێش، وەکو پرسیار کردن دەربارەی بابەتێکی دین و لەپشت پەردەوە پرسیاریان لێ بکرێت، لەکاتێکدا ئەوان بەڕێزترین و بەشکۆترین و پاکترین ئافرەتن ڕەزای خوایان لێبێت، وە ئەمەش لەسەر هەمان مانا بۆ هەموو ئافرەتانی تریشە کە بەو شێوەیە شەریعەت هاتووە کە ئافرەت هەموو شتێکی عەورەتە، لاشەی و دەنگی.

• حیجاب پاککەرەوەی دڵە و پارێزی نەفسە، وەک چۆن خوای گەورە دەفەرموویت: (فَاسأَلوهُنَّ مِن وَراءِ حِجابٍ ذٰلِكُم أَطهَرُ لِقُلوبِكُم وَقُلوبِهِنَّ)

وە حیجاب نیشانە و دروشمی شەرمە، یعلى بن أمیة دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إن الله یحب الحیاء والستر» «خوای گەورە شەرم و داپۆشینی لەلا خۆشەویستە»[١]

أبو زید دەڵێت: خفرت المرأة واتە شەرمی کرد ئافرەتە، وە الخفر واتە شەرم، عەرەب لەکۆندا دەیووت: باشترین ئافرەت ئەوەیە کە خۆی تەرخان بکات بۆ خزمەتی مێردی وە بەشەرم و حەیا لەلای قەوم و کەسەکەی خۆی.

فرزدق دەڵێت:

*یأنسن عند بعولهن إذا خلوا      وإذا هم خرجوا فهنّ خفارُ*

*لای هاوسەرەکانیان نازدارن کاتێک بەتەنیان*

*کاتێکیش هاوسەرەکانیان دەچنە دەرەوە ئەمان بەشەرم و حەیان*[٢]

وە فەرموودەکەی أم سلمة بۆ عائشة:

« غَضُّ الأطْراف وخَفَرُ الأَعْرَاض» « چاوەکانیان نزمە و دەیپارێزن وە بەشەرمن لەشەرەفیان» مەبەستی ئافرەتانە کە دەبێت بەشەرم بن و پارێزگاری لەخۆیان بکەن و خۆیان دابپۆشن[٣].

---

(١) رواه أحمد (١٧٩٦٨)

(٢) غریب الحدیث لابن قتیبة ( ١ / ٥٢٢ )

(٣) النهایة في غریب الحدیث (٣ / ٢٠٩)

• **بەڵگەی پێنجەم:** خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ (الأحزاب: ٣٣)

ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه‌وسلم) لەماڵەکانی خۆتاندا بەسەنگینی و سەلاری بسرەون، زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخن وەکوو سەردەمی نەفامی یەکەم، نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن (لەماڵ و سامان)، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێت هەموو ناپاکی و ناسازی و نادروستیەك لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی خاوخێزانی ماڵی پێغەمبەرو بەتەواوی پاکتان بکاتەوە (دوور لەهەموو ناتەواوی و قسەو قسەڵۆکێك).

**سوودێک:**

• خوای گەورە فەرمانی کردووە بەئافرەتان کە حیجاب بکەم و خۆیان داپپۆشن و لەماڵەکانیان بمێننەوە، کە پێچەوانەی دروشمی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی بووە، کە ئافرەت بەلای پیاواندا دەڕۆشت و سنگی دیار بووە، وە هەبووە کە مل و گەردنی دەرخستووە وە یا پرچی قژی یاخود گوارەی گوێی، خوای گەورە فەرمانی بە ئافرەتانی باوەڕدار کرد کە لەهەموو بارێکیان خۆیان داپپۆشن[١].

• خۆ دانەپۆشین لەنیشانەکانی سەردەمی نەفامیە بەدەقی قورئانی پیرۆز، وە ئافرەتی خۆ دانەپۆشەر دەچێتە ڕیزی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرموویەتی: ومبتغ في الإسلام سنة الجاهلية

«وە ئەو کەسەی دەیەوێت دروشمێکی نەفامی بکاتە ناو ئیسلامەوە»[٢]

(١) تفسير ابن كثير (٦ / ٤٦)
(٢) رواه البخاري (٦٨٨٢)

## شێوازەکانی خۆ دانەپۆشین

ا) لابردنی خیمار : جا ئافرەت ڕووخساری دەرخات یاخود سەرپۆشەکەی لە بەشێکی سەری لادات یا لە هەمووی سەری لابدات ئەوانە هەمووی خۆ دانەپۆشینە.

ابن عباس دەربارەی ئەم ئایەتە:( وَلا تَبَرَّجنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيَّةِ الأولى ) فەرموویەتی:

كان فيما بين نوح وإدريس، وكانت ألف سنة، وإن بطنين من ولد آدم كان أحدهما يسكن السهل، والآخر يسكن الجبل، وكان رجال الجبل صباحا، وفي النساء دمامة، وكان نساء السهل صِبَاحًا، وفي الرجال دمامة، وإن إبليس أتى رجلا من أهل السهل في صورة غلام، فأجر نفسه منه، وكان يخدمه، واتخذ إبليس شيئا مثل ذلك الذي يزمر فيه الرعاء، فجاء فيه بصوت لم يسمع مثله، فبلغ ذلك من حولهم، فانتابوهم يسمعون إليه، واتخذوا عيدا يجتمعون إليه السنة، فتتبرج الرجال للنساء، قال: ويتزين النساء للرجال، وإن رجلا من أهل الجبل هجم عليهم وهم في عيدهم ذلك، فرأى النساء، فأتي أصحابه فأخبرهم بذلك، فتحولوا إليهن، فنزلوا معهن، فظهرت الفاحشة فيهن، فهو قول الله: (وَلا تَبَرَّجنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيَّةِ الأولى)

لەنێوان پێغەمبەر نوح و إدريس هەزار ساڵ هەبوو، وە نەوەی ئادەم دوو کۆمەڵە بوون، کۆمەڵێک لەدەشت دەژیان و کۆمەڵێک لەسەر شاخ دەژیان، جا پیاوانی ئەوانەی لەسەر شاخ دەژیان جوان بوون، و ئافرەتەکانیان ناشرین بوون، وە ئافرەتەکانی ئەوانەی لەدەشت دەژیان جوان بوون و پیاوەکان ناشرین بوون، جا ئیبلیس هات بۆلای پیاوێک لەوانەی لەدەشت دەژیان لەسەر شێوەی کوڕێکی لاو، و خۆی کرد بەخزمەتکاری و ئیشی بۆ کرد، ئەو زوڕنایەی شوانەکان بەکاریان دەهێنا بۆ ئاژەڵەکان لەشێوەی ئەو شتێکی دروست کرد ، دەنگێکی لێدەهات پێشتر نەبیسترابوو، خەڵکی تر ئەم باسەیان بیست و حەزیان کرد ئەوانیش گوێیان لەو دەنگە بێت، ڕۆژێکیان دانا لەساڵێک وەک جەژن -کۆدەبوونەوە بۆ گوێ گرتن لەو دەنگە-، پیاوان

خۆیان ئەڕازاندەوە بۆ ئافرەتەکان، وە ئافرەتەکان خۆیان ئەڕازاندەوە بۆ پیاوەکان، پیاوێک لەوانەی لەشاخ دەژیا ڕۆژێک لە جەژنێکیان ئەمانەی بینی و ئافرەتەکانیانی بینی، چوو بۆلای هاوەڵەکانی و بۆی باسکردن، ئەوانیش شوێنیان گۆڕی و دابەزین و چوون بۆلای ئەو ئافرەتانەی لەدەشت بوون، ئیتر داوێن پیسی بلاَو بۆیەوە تیایاندا، ئەوەش فەرمایشتی خوای گەورەیە:(وَلا تَبَرَّجنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيَّةِ الأولى)[١]

مقاتل بن سليمان دەفەرمووێت:

التبرج أنها تلقى الخمار عن رأسها، ولا تشده فيرى قرطها وقلائدها. أمرهن أيضا بالعفة، وأمر بضرب الحجاب عليهن.

خۆ دانەپۆشین ئەوەیە کە سەرپۆش بکاتە سەری و توندی نەکا،کە وادەکا گواره و و ملوانکەکەی دەربکەوێ، خوای گەورە فەرمانی پێکردوون بە داوێن پاکی و خۆ داپۆشینی تەواو بەحیجاب[٢].

٢) چونە دەرەوەی ئافرەت و تێکەلاَویان لەگەڵ پیاوان، وە ئۆقرە نەگرتن لەمانەوە لەناو ماڵەکانیان

مجاهد دەفەرمووێت: كانت المرأة تتمشى بين الرجال فذلك تبرج الجاهلية.

ئافرەت لەنێوان پیاواندا دەڕۆشت، ئەوەش خۆدانەپۆشینی سەردەمی نەفامی بوو[٣].

وعن قتادة (وَلا تَبَرَّجنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيَّةِ الأولى) أي إذا خرجتن من بيوتكن، قال: كانت لهن مشية وتكسر وتغنج، يعني بذلك: الجاهلية الأولى، فنهاهن الله عن ذلك , وە قتادە دەفەرمووێت: (وَلا تَبَرَّجنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيَّةِ الأولى) ئافرەتانی سەردەمی جاهیلی کاتێک دەچوونەوە دەرەوە لە ماڵەکانیان ڕۆشتنیان بە لەنجە و لار بوو، خوای گەورە مەبەستی بە «الجاهلية الأولى » ئەوە بوو، بۆیە ڕێگری کرد لە ئافرەتان لەو ڕۆشتن بە لەنجە و لارە.

---

(١) تفسير الطبري ( ٢٠ / ٢٦١)
(٢) تفسير المقاتل ( ٣ / ٤٨٨)
(٣) تفسير عبد الرزاق (٣ / ٣٧)

هاوەڵی بەڕێز عبد الله کوڕی مەسعود دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی:

«إن المرأة عورة، فإذا خرجت استشرفها الشيطان، وأقرب ما تكون من وجه ربها وهي في قعر بيتها»

«ئافرەت عەورەتە، گەر بچێتە دەرەوە لەماڵ شەیتان دەری دەخات بۆ خەڵکی و دەیڕازێنێتەوە لە چاویاندا وە نزیکترین کات کە ئافرەت لەڕووی خوای خۆیەوە نزیک بێت ئەوکاتەیە لە کونجی ماڵەکەی خۆیدا بێت»[١]

عبد الله کوڕی مەسعود دەفەرموویت:

«إن المرأة عورة، وإنها إذا خرجت من بيتها استشرفها الشيطان فتقول: ما رآني أحد إلا أعجبته، وأقرب ما تكون إلى الله إذا كانت في قعر بيتها».

«ئافرەت عەورەتە، گەر بچێتە دەرەوە لەماڵ شەیتان دەری دەخات بۆ خەڵکی و دەیڕازێنێتەوە لە چاویاندا ، لەنەفسی خۆیدا دەڵێت: هەر کەس سەیرم کات دیارە سەرسامم بووە، وە نزیکترین کات کە ئافرەت لە خوای گەورەوە نزیک بێت ئەوکاتەیە لە کونجی ماڵەکەی خۆیدا بێت»[٢]

هەر بۆیە نوێژی ئافرەت لەماڵەکەی خێرترە بۆی لەنوێژی مزگەوتدا. وە ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەدوای وەفاتی ببینیایە ئافرەتان چیان داهێناوە ئەوە ڕێگری لێدەکردن لە چوون بۆ مزگەوت.

عەمرە دەگێڕێتەوە لە عائشە کە دەفەرموویت :

« لو أدرك رسول الله ’ ما أحدث النساء لمنعهن كما منعت نساء بني إسرائيل“. قلت لعمرة: أومنعن؟ قالت: نعم».

«ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ببینیایە ئافرەتان چیان داهێناوە و چی دەکەن، ئەوە ڕێگری لێدەکردن لە چوون بۆ مزگەوت وەک چۆن ئافرەتانی نەوەی ئیسرائیل ڕێگەیان لێگیرا بچن بۆ مزگەوت»، بە عەمرەم ووت: ئایا

---

(١) صحيح ابن خزيمة ( ١٦٨٥)

(٢) المعجم الكبير للطبراني ( ٩٤٨١)

ئەوان ڕێگەیان لێگیرا؟، فەرمووی: بەڵێ[١].

وعن الثوري، عن الأعمش، عن إبراهيم قال: «.كن له ثلاث نسوة ما صلت واحدة منهن في مسجد الحي».

ئیبراهیمی نەخەعی : سێ خێزانی هەبوو، هیچ کامیان نوێژێکی لەمزگەوتی گەڕەکەکە نەکردووە[٢].

وە دەگێڕدرێتەوە لە ابن المبارک کە فەرموویەتی:

«أكره اليوم الخروج للنساء في العيدين، فإن أبت المرأة إلا أن تخرج فليأذن لها زوجها أن تخرج في أطمارها ولا تتزين، فإن أبت أن تخرج كذلك فللزوج أن يمنعها عن الخروج».

« لەم ڕۆژگارە بەلامەوە باش نیە ئافرەت بچێت بۆ نوێژی جەژنەکان، ئەگەر ئافرەتەکە پێداگیری کرد کە هەر بچێت ئەوە با مێردەکەی ڕێگەی پێبدات و خۆی دابپۆشێت بە پۆشاکەکانی و خۆی نەڕازێنێتەوە، ئەگەر پێداگیری کرد بەڕازاوەیی بچێت ئەوە مێردەکەی دەتوانێت ڕێگری لێبکات کەبچێت بۆ نوێژی جەژن».

دەگێڕدرێتەوە لە سفيان الثَّوري : « أنه كره اليوم الخروج للنساء إلى العيد».

« چوونی ئافرەتانی بۆ نوێژی جەژن بەلاوە باش نەبووە - بە مەکروهی زانیوە -»[٣].

وە فەرموویەتی: «ليس للمرأة خير من بيتها وإن كانت عجوزا».

«هیچ شوێنێک بۆ ئافرەت باشتر و خێرتر نیە بۆی وەک لەماڵەکەی خۆی گەرچیش بەتەمەن بێت»[٤].

ابن باز فەرموویەتی: «وخير حجاب المرأة بعد حجاب وجهها باللباس، هو بيتها».

---

(١) رواه البخاري (٨٦٩)
(٢) مصنف عبد الرزاق (٥١١٨)
(٣) رواه الترمذي (٥٤٠)
(٤) لاستذكار لابن عبد البر ( ٢ / ٤٩٦ )

«وە باشترین حیجاب بۆ ئافرەت دوای حیجابی ڕووخساری بەپۆشاک، ماڵەکەیەتی» [١].

**٣)** دەرخستنی ئافرەت بۆ جوانیەکانی لەبەرامبەر پیاواندا.

ابن مسعود دەگێڕێتەوە:

نهى رسول الله ' عن عشر خلال: ... _وذكر منها_ « وعن التبرج بالزينة لغير محلها ».

پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لەچوار خەسڵەت کردووە:..... -تیایدا باسی لەمانە کردووە- «وە جوانی دەرخستن و ڕازندنەوە بۆ غەیری کەسی خۆی»[٢].

وعن ابن أَبي نجيح، قال: التبختر. وقيل إن التبرج هو إظهار الزينة، وإبراز المرأة محاسنها للرجال.

وە ووتراوە: خۆ دەرخستن بریتیە لە دەرخستنی زینەت و ڕازاوەیی، وە دەرخستنی ئافرەتە بۆ جوانیەکانی بۆ پیاوان[٣].

معمر فەرموویەتی: « التبرج أن تخرج محاسنها»

«خۆ دەرخستن بریتیە لەوەی جوانیەکانی دەربخات»[٤].

**٤)** دەرچوونی ئافرەت لەماڵەکەی بەبۆن خۆشی.

ئەگەر چیش بەپۆشاکێکی داپۆشراوەوە بچێتە دەرەوە لەماڵەکەی ئەوە هەر خۆ دەرخەرە وخۆی دانەپۆشیووە بەتەواوی گەر بەبۆنەوە بچێتە دەرەوە.

عن ابن جريج، عن عطاء قال: كان يُنْهَى أن تطيب المرأة، وتزين ثم تخرج.

« قلتُ: والناكح؟ قال: والناكح ، ثم قال: ﴿وَلا تَبَرَّجنَ﴾ (الأحزاب: ٣٣)

قال له آخر: وتبرج ذلك؟ قال: نعم، تخرج كذلك، فيسأل عنها من هي؟

ابن جريج دەگێڕێتەوە پێشەوا عطاء فەرموویەتی : ڕێگری و نەهی کراوە

---

(١) مجموع الفتاوى (١ / ٤١٨)

(٢) المعجم الأوس (٩ / ١٥٦)

(٣) تفسير الطبري ( ٢٠ / ٢٥٩).

(٤) صحيح البخاري ( ٦ / ١١٦)



لەوەی ئافرەت بۆن لەخۆی بدات و خۆی برازێنێتەوە ئەوجا بچێتە دەرەوە، ووتم: ئەگەر زەواجیشی کردبێت؟، فەرمووی: ئەگەر زەواجیشی کردبێت، دواتر فەرمووی: (وَلا تَبَرَّجنَ) الأحزاب٣٣، کەسێکی تر ووتی: واتە ئەوەش خۆ دەرخستنە؟، فەرمووی: بەڵێ، ئاوا دەچێتە دەرەوە، خەڵکیش دەربارەی دەپرسن، ئەمە کێ یە؟

وە بۆن لەخۆ دەر بەس خۆ دەرخەر نیە، بەڵکو خۆ دەرخەر و زیناکارە.

أبو موسى الأشعري دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«أيما امرأة استعطرت، فمرت بقوم ليجدوا ريحها فهي زانية »

« هەر ئافرەتێک بۆن لەخۆی بدات، بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆشت تا بۆنی بکەن، ئەوە زیناکارە[١]»

ئەمەش ئاشکرایە ئافرەتێک ناچێت ببێت بە فیتنە و سەرنجی پیاوان بەمە ڕابکێشێت بۆخۆی ئیلا بەهۆی لاوازی لە داوێن پاکیدا نەبێت.

بۆیە شوبهێنراوە بە زیناکار بەهۆی ئەنجامدانی کارێک کە سەرەتای دەستپێکە بۆ زینا، وەک لەفەرموودەکەی أبو هريرة کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«لكل بني آدم حظ من الزنا، فالعينان تزنيان وزناهما النظر، واليدان تزنيان وزناهما البطش، والرجلان تزنيان وزناهما المشي، والفم يزني وزناه القبل، والقلب يهوى ويتمنى، والفرج يصدق ذلك، أو يكذبه»

«هەمووی نەوەی ئادەمێک بەشی خۆی هەیە لەزینا، چاوەکان زینا دەکەن زیناکەشیان سەیر کردنی حەڕامە، وە دەستەکان زینا دەکەن زیناکەیان دەست بردنە بۆ حەڕام، وە پێ کان زینا دەکەن زیناکەیان ڕۆشتنە، وە دەم زینا دەکات زیناکەی ماچ کردنە، وە دڵ ئاوات دەخوازێت و ئومێد دەکات، وە داوێنیش ئەمانە بەڕاست دەکاتەوە یاخود بەدرۆی دەخاتەوە»[٢]

---

(١) رواه أحمد (١٩٧١١)

(٢) رواه أحمد ( ٨٥٢٦)



وە گەرچی زیناکار بێت یاخود نا، ئەو لەو کەسانەیە کە خوای گەورە زۆری ڕق لێیانە، وە لەناو ئیسلام دەیەوێ خەسڵەتێکی سەردەمی نەفامی تێبکات، وە ناوترێ هەموو خۆ دەرخەرێک و بۆن لەخۆ دەرێک کاری داوێن پیسی گەورە دەکات کە شایستەی لێدانی جەلد و بەرد باران کردنە.

کارەکە لەنێوان خۆی و خوای گەورەیە کە چۆن سزای بدات کە خوای گەورە ڕقی لێ یەتی بەو شێوازە ببینێت، ئەم کارە دەکات بەرامبەر پیاوان.

وە ئافرەتانی ئەمڕۆ لەگەڵ دیمەنی خۆ دەرخستنن لەکەم تا زۆر، اللّٰه المستعان.

با ئافرەت سەیری خۆی بکات، وە لەخوای گەورە بترسێت، وە بزانێت خراپترین ئافرەتەکان ئەوانەن کە خۆیان دەردەخەن و خۆیان دەڕازێننەوە.

أبو أذينة الصدفي دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«خير نسائكم الودود الولود المواتية المواسية، إذا اتقين اللّٰه، وشر نسائكم المتبرجات المتخيلات وهن المنافقات لا يدخل الجنة منهن، إلا مثل الغراب الأعصم »

«باشترین ئافرەتەکانتان ئەوانەن ڕوو خۆشن، مناڵیان زۆر دەبێت، هاوڕای مێردەکەیەتی ویارمەتی دەریەتی، ئەگەر لەخوای گەورە بترسن، وە خراپترین ئافرەتەکانتان ئەوانەن کە خۆیان دەردەخەن و خۆیان داناپۆشن بەڕاستی ئەوانە دووڕووەکانن، ئەو ئافرەتانە ناچنە بەهەشتەوە ئیلا وەکو قەلەڕەشی پێ سپی نەبێت- جۆرێک باڵندەی کەم و دەگمەنە واتە زۆر بەدەگمەن ئەو ئافرەتانە بچنە بەهەشت-»[1]

وە بزانێت ئافرەتە خۆ دەرخەر و خۆ دانەپۆشەرەکان خوای گەورە زۆر ڕقی لێیانە، ابن عباس دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:

« أبغض الناس إلى اللّٰه ثلاثة: ملحد في الحرم، ومبتغ في الإسلام سنة الجاهلية، ومطلب دم امرئ بغير حق ليهريق دمه »

---

(١) الترهيب والترغيب لقوام السنة الأصبهاني (١٥٢٧) ،السنن الكبرى للبيهقي (١٣٤٧٨)

«سێ کەس هەن خوای گەورە زۆر ڕقی لێیانە: ستەم و تاوان و گوناحی گەورە لە حەرەمدا[١] وە کەسێک بیەوێت دروشمێکی سەردەمی نەفامی بکاتە ئیسلامەوە، وە کەسێک بەدوای کوشتنی کەسێکەوە بێت بەبێ هەق تا خوێنی بڕێژێت»[٢]

(١) الإلحادُ: بریتیە لە لادان لە حەق
(٢) رواه البخاري ( ٦٨٨٢)

سێهەم

## فەرمووده و أثار لەسەر واجبێتی حیجاب

### داپۆشینی هەموو لاشە و ڕووخسار

عن أم عطية رضي الله عنها قالت: أمرنا أن نخرج الحيض يوم العيدين، وذوات الخدور فيشهدن جماعة المسلمين، ودعوتهم ويعتزل الحيض عن مصلاهن، قالت امرأة:

يا رسول الله إحدانا ليس لها جلباب؟ قال: «لتلبسها صاحبتها من جلبابها»

أم عطية دەفەرموویت: فەرمانمان پێکرا کە ئەو ئافرەتانەشی لەسوڕی مانگانەدان و ئەوانەشی گەنجن و زەواجیان نەکردووە بێنە دەرەوە و ئامادەبن لەگەڵ موسوڵمانان لە نوێژ و دووعای جەژنەکاندا، وە ئەو ئافرەتانەی نوێژ ناکەن و لەسوڕی مانگانەدان نەچنە ناو مصلی- مزگەوت- ەکە، ئافرەتێک ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئافرەتێک گەر حیجابی نەبوو چیبکات؟، فەرمووی: «با هاوەڵێکی حیجابێکی خۆی پێبدات».

قال ابن رجب: وهذا يدل على أن أخذ المراة الجلباب في صلاة العيدين ليس هو لأجل الصلاة، بل هو للخروج بين الرجال، ولو كانت المراة حائضا لا تصلي، فإنها لا تخرج بدون جلباب

ابن رجب دەفەرموویت: ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە حیجاب لەبەر کردنی ئافرەتەکە بۆ ئەوە نیە کە نوێژی پێوە بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لەنێو پیاواندا دەچنە دەرەوە و دەیان بینن، وە ئەگەر ئافرەت نوێژیش نەکات و لەسوڕی مانگەنەدا بێت نابێت بچێتە دەرەوە بەبێ حیجاب- واتە حیجابەکە بۆ نوێژ نیە ئەم ئافرەتانە نوێژیش ناکەن و فەرمانیان پێکراوە بەبێ حیجاب نەچن بۆ دەرەوە-.[1]

هەروەها واجبێتی حیجابی تێدایە کەدەبێت ئافرەت هەموو لاشەی

(١) فتح الباري ( ٢ / ٣٤٥)

داببپۆشێت، چونکە گەر واجب نەبوایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی نەدەکرد هاوەڵەکەی حیجابی بداتێ بەکاتی.

مجاهد دەگێڕێتەوە لە عائشە کە فەرموویەتی:

«کان الرکبان یمرون بنا، ونحن مع رسول الله ' محرمات، فإذا حاذوا بنا، أسدلت إحدانا جلبابها من رأسها علی وجهها، فإذا جاوزونا کشفناه »

« کاتێک لەئیحرامدا بووین کەسانێک بەسوارەوە بەلاماندا تێپەڕین ئێمەش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ئیحرامدا بووین-ئیحرام بۆ ئافرەت دەبێت نیقاب نەکات تەنها قوماشێک بدات بە ڕووخساریدا-، کاتێک نزیک دەبوونەوە لێمان یەکێک لە ئێمە سەرپۆشەکەی دەدا بە ڕوخساریدا و دای دەپۆشی، کاتێک ئێمەیان تێدەپەڕاند بەرزمان دەکردەوە» .[١]

ئەمەش بەڵگەی ڕوونە بۆ واجبێتی داپۆشینی ڕووخسار تەنانەت لەکاتی ئیحرامدا، لەگەڵ ئەوەی ئافرەتێک لە ئیحرامدا بێت نابێت نیقاب بکات و ڕووخساری داببپۆشێت، بەڵام گەر پیاوانی غەیرە و نامەحرەمی لێبوو ئەوە دەبێت ڕووخساری داببپۆشێت- بەقوماشێک-، وەک چۆن عائشە و أسماء گێڕاویانەتەوە.

أسماء دەفەرمووێت:

« کنا نغطي وجوهنا من الرجال، وکنا نمتشط قبل ذلك»

« ئێمە ڕووخسارمان دادەپۆشی بەرامبەر بە پیاوان، وە پێش ئیحرام کردن قژمان شانە دەکرد»[٢]

إبراهیمی نەخەعی فەرموویەتی:

«إذا حاضت المرأة اختمرت واجب علیها ما علی أمها»

« ئەگەر ئافرەت تووشی سوڕی مانگانە هات ئەوە دەبێت خۆی داببپۆشێت و ڕووخساری داببپۆشێت هەمان شتی لەسەر واجب دەبێت کە لەسەر دایکی واجبە»[٣]

---

(١) رواه أحمد (٢٤٠٢١) وأبو داود (٢٩٣٥)

(٢) رواه بن خزیمة في صحیحه (٢٦٩٠) والحاکم في المستدرك (١٦٦٨)

(٣) مصنف عبد الرزاق (٥٠٤١)

علقمة بن أبي علقمة دەگێڕێتەوە لەدایکی کە دەفەرموویت: « دخلت حفصة بنت عبد الرحمن على عائشة زوج النبي ، وعلى حفصة خمار رقيق. فشقته عائشة وكستها خمارا كثيفا»

حفصة کچی عبدالرحمن ی کوڕی ئەبی بەکر چوو بۆلای عائشەی خێزانی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، جا حفصة سەرپۆشێکی و ڕووپۆشێکی تەنکی پێوە بوو، عائشە دڕاندی و پۆشاکێکی ئەستوری پێدا[١]

وعن هشام بن عروة أن المنذر بن الزبير قدم من العراق فأرسل إلى أسماء بنت أبي بكر بكسوة من ثياب مروية وقوهية رقاق عتاق بعد ما كف بصرها. قال: فلمستها بيدها ثم قالت: أف! ردوا عليه كسوته. قال: فشق ذلك عليه وقال: يا أمه إنه لا يشف. قالت: إنها إن لم تشف فإنها تصف.

هشام بن عروة دەگێڕێتەوە کە مونذیری کوڕی زوبەیر لەعێراقەوە هات پۆشاکێکی نارد بۆ ئەسمای کچی ئەبی بەکر کە لەمەرو دروستکرابوو ڕەنگی سپی بوو تەنک بوو لە قوماشێکی چاک دروست کرابوو، ئەوکاتە ئەسماء چاویشی لەدەست دابوو، دەستی دا لەقوماشەکە و فەرمووی: ئای لەو قوماشە! بینێرنەوە بۆ خاوەنەکەی، مونذیر پێی ناخۆش بوو، ووتی: دایکە تەنک نیە پێستت دەربخات، فەرمووی: ئەگەر تەنکیش نەبێت خۆ قەبارەی لاشە هەر دەردەخات![٢]

وعن عمرة بنت عبد الرحمن أنها قالت: ابتاعت عائشة قبطية فأرسلت بها إلى أسماء أختها وقالت: اختمري بها واجعلي تحتها وقايةً .

عمرة بنت عبدالرحمن دەفەرموویت: عائشە ڕەزای خوای لێبێت پۆشاکێکی قبطي-پۆشاکێکی سپیە لە کەتانی تەنک- کڕی، ناردی بۆ اسماء ی خوشکی، و فەرمووی: خۆتی پێ دابپۆشە وە لەژێریشی پۆشاکی تر بکە-بۆ ئەوەی لاشەی دەرنەکەوێ-[٣].

(١) رواه مالك (٣٣٨٣)
(٢) الطبقات الكبرى (٨ / ١٩٩)
(٣) أدب النساء لعبد الملك بن حبيب (١٢١)

پێشەوا مالیک فەرموویەتی : بلغني أن عمر بن الخطاب رضي الله عنه نهى النساء أن يلبسن القباطي

قال: وإن كانت لا تشف، فإنها تصف.

قال مالك: معنى تصف أي تلصق بالجلد.

پێم گەیشتووە کە عومەری کوڕی خەطاب ڕەزای خوای لێبێت ڕێگری کردووە لەوەی ئافرەتان پۆشاکی قبطي لەبەر بکەن، وە فەرموویەتی: ئەگەر تەنکیش نەبێت پێستی دەربخات، قەبارەی لاشە هەر دەردەخات.

پێشەوا مالیک فەرموویەتی: قەبارەی لاشە دەردەخات واتە بەگیانیدا دەنووسێت قوماشەکە.

و سُئِل مالك  عن الوصائف يلبسن الأقبية فقال ما يعجبني ذلك، وإذا شدتها عليها ظهر عجزها، ومعنى ذلك أنه لضيقه يصف أعضاءها عجزها وغيرها مما شرع ستره والله أعلم وأحكم

وە پرسیار لە مالک کرا دەربارەی خزمەتکاری ئافرەت کە پۆشاکێک لەبەر دەکەن پێی دەوترا قباء- کە پۆشاکیکی پان بوو وەک سەرشان دەدرا بەسەر شاندا و پشتی دادەپۆشی و پێشەکەی کراوە بوو- فەرمووی: بەدڵم نیە و بەباشی نازانم، فەرمووی وە ئەگەر توندی بکات لەخۆی پاشەوەی ئافرەتەکە دەردەکەوێت، مەبەستی ئەوەیە ئەو بەشانەی لاشەی ئافرەتەکە داناپۆشێ و دەریدەخات کە پێویستە داپۆشرێت والله اعلم[١].

يعقوب بن مجمع دەگێڕێتەوە لە مجمع بن يزيد بن جارية دەگێڕێتەوە کە عمر بن الخطّاب ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی:

القباطي إلا تشف، فإنها تصف، فرجع مجمع بن يعقوب إلى امرأته وقد درعها قبطية، فرفعها، ثم ارتدى بها.

پۆشاکی قبطي ئەگەر تەنکیش نەبێت پێست دەربخات، قەبارەی لاشە هەر دەردەخات، مجمع بن يعقوب یش کە ئەمە دەبیستێت لەباوکی دەڕواتەوە

(١) المنتقى شرح الموطأ (٧ / ٢٢٤)

ماڵەوە بۆلای خێزانەکەی کە پۆشاکی قبطي بۆ کڕی بوو پێی دەگۆڕێت بە پۆشاکێکی تر لەژێرەوە و ئینجا ئەم بکات بەسەر پۆشاکەکەی تردا[١].

وە هەموو ئەمانە لەترسی ئەو سزا قورسانە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە لەفەرموودەکان دەربارەی ئەو ئافرەتانەی داپۆشراوی ڕووتن، ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی:

« صنفان من أهل النار لم أرهما، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات، رءوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة، ولا يجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا »

«دوو کۆمەڵە هەن لە ئەهلی دۆزەخ تا ئێستا نەمبینیوون، کۆمەڵێک قامچیان پێ یە وەک کلکی مانگا لەخەڵکی دەدەن پێی، وە ئافرەتانێک داپۆشراون بەڵام ڕووتن، خۆیان لار دەکەنەوە، سەریان وەکو پشتی حوشتر خوارە، نەدەچنە بەهەشتەوە نە بۆنی دەکەن، کە بۆنی بەهەشتیش لەڕێی ئەونە و ئەونەوە بۆنی دێت» [٢]





(١) التاريخ الكبير للبخاري (٣٤٥٤)
(٢) رواه مسلم (٢١٣٨)



## داپۆشینی دەست و قاچەکان

ابن عمر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«من جر ثوبه خيلاء لم ينظر الله إليه يوم القيامة». فقالت أم سلمة: فكيف يصنعن النساء بذيولهن؟ قال: «يرخين شبرا» ، فقالت: إذا تنكشف أقدامهن؟ قال: «فيرخينه ذراعا، لا يزدن عليه».

«هەر کەس پۆشاکەکەی درێژ بکاتەوە و بخشێ بە لوت بەرزیەوە، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی سەیری ئەو کەسە ناکات»،

أم سلمة ووتی: ئەی ئافرەتان چی بکەن بە دامێنی جلەکانیان؟، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « با بستێ درێژی بکەنەوە»، أم سلمة ووتی: جا کەواتە قاچەکانیان دەردەکەوێت، فەرمووی: « کەواتە با باڵێک درێژی بکەنەوە و لەوە زیاتر درێژ نەبێت»[١]

مجاهد فەرموویەتی: « كانت المرأة من النساء الأولى تتخذ لكم درعها أزرارا تجعله في إصبعها تغطي به الخاتم».

ئافرەتانی هاوەڵان قۆپچەی دەکرد بۆ قۆڵی کراسەکەی و بەدەستی دەیگرت تا مستیلەکانی دەستی پێ داپۆشێت. [٢]

عماره بن خزيمة دەگێڕێتەوە:

كنا مع عمرو بن العاص في حج أو عمرة حتى إذا كنا بمر الظهران، فإذا امرأة في هودجها قد وضعت يدها على هودجها، قال: فمال فدخل الشعب فدخلنا معه، فقال: كنا مع رسول الله ' في هذا المكان، فإذا نحن بغربان كثيرة، فيها غراب أعصم أحمر المنقار والرجلين، فقال رسول الله ': «لا يدخل الجنة من النساء إلا مثل هذا الغراب في هذه الغربان»

قال حسن: فإذا امرأة في يديها حبائرها وخواتيمها قد وضعت يديها، ولم يقل حسن بمر الظهران

---

(١) رواه الترمذي (١٧٣١)

(٢) التفسير من سنن سعيد بن منصور(١٥٨٦) و مسند أبي يعلى (٦٩٨٩)

لەگەڵ عەمری کوڕی عاص بووین لە حەج یا عومرە بووین کاتێک گەیشتین بە مرو الظهران[١]، ئافرەتێکمان بینی لەناو تاراکەی بوو- کە لەسەر حوشتر دادەنرێت- دەستی گرتبوو بە تاراکەیەوە، عمرو لایداو بەنێوان دوو شاخدا ڕۆشت ئێمەش لەگەڵی ڕۆشتین، فەرمووی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەم شوێنە بووین، کۆمەڵێکی زۆر قەلەڕەشمان بینی، هی وای تێدا بوو دەنووک و پێکانی سوور بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « ئافرەتان ناچنە بەهەشت ئیلا وەک ڕێژەی ئەم قەلەڕەشە-سوورانە- لەناو قەلەڕەشەکانی تر»

حەسەن فەرموویەتی: ئافرەتەکە ئاڵتون و مستیلەی لەدەستدا بوو وە دەستی دەرخستبوو[٢]. (حەسەن لە ڕیوایەتەکەیدا( مرو الظهران) ی باس نەکرد )

أبو بكر بن عبد الرحمن بن الحارث بن هشام فەرموویەتی :

كل شيء من المرأة عورة حتى ظفرها.

فەرموویەتی هەموو شتێک لەئافرەتدا عەورەتە تەنانەت نینۆکەکانیشی[٣].

أبو طالب لە پێشەوا ئەحمەدوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: « ظفر المرأة عورة، فإذا خرجت فلا يبين منها شيء ولا خفها، فإن الخف يصف القدم، وأحب إلي أن تجعل لكمها زرا عند يدها لا يبين منها شيء».

«نینۆکی ئافرەت عەورەتە، ئەگەر چووە دەرەوە با هیچ شتێکی دیار نەبێ تەنانەت خوفەکانیشی - خوف پێڵاوێکە لە پێست دروست دەکرا-، چونکە خوف قاچ و قەبارەکەی دەرەخات، وە پێم باشە قۆپچە دابنێ بۆقۆڵەکانی تاوەکو هیچی دەرنەکەوێت»[٤].

ئەم ئەثەر و گێڕانەوانە دەریدەخات کە پێویستە ئافرەت قاچ و دەستی دابپۆشێت، وە هیچ شوێنێکی دەرنەخات و جوانی دەستی دەرنەکەوێی، چونکە دروست نیە.

---

(١) مرو الظهران : بط مر و وادي فاطمة پێ دەوترێت دۆڵیکی گەورەیە لە توهامە لە ناوچەی مەککە

(٢) رواه أحمد (١٧٨٢٦)

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (١٧٧١٢)

(٤) الفروع لابن مفلح (٨ / ١٨٦)



## شێوازی نوێژی ئافرەت لە نوێژدا

وعن ابن جريج قال: قلت لعطاء : أتشير المرأة بيديها كالرجال بالتكبير قال: «لا ترفع بذلك يديها كالرجال، وأشار فخفض يديه جدا وجمعهما إليه» وقال: «إن للمرأة هيئة ليست للرجل»

ابن جريج فەرمووی پرسیارم لە عطاء كرد ئایا ئافرەت وەک پیاو دەستی بەرز دەكاتەوە لەكاتی دەست پێكی نوێژ بە الله أكبر؟، فەرمووی: وەكو پیاوان دەستی زۆر بەرز ناكاتەوە با دەستی نزم تر بێت و لەیەک نزیک بن، وە فەرمووی: ئافرەت شێوازی جیاوازە لەپیاو[١].

عن ابن جريج، عن عطاء قال: «تجمع المرأة يديها في قيامها ما استطاعت»

ابن جریج دەگێڕێتەوە لە عطاء كە فەرموویەتی: «ئافرەت چەنێک بتوانێت لەكاتی بەپێوە وەستانی با دەستەكانی كۆبكاتەوە»[٢]

عن معمر، عن الحسن، وقتادة، قالا: «إذا سجدت المرأة فإنها تنضم ما استطاعت، ولا تتجافى لكي لاترفع عجيزتها»

حسن وقتادة دەفەرموون: «ئەگەر ئافرەت سوجدەی برد با خۆی كۆبكاتەوە چەنێک توانی، وە با قاچەكانی نەكاتەوە بۆ ئەوەی سمتی دەرنەكەوێت»[٣]

قال الشافعي : « وقد أدب الله تعالى النساء بالاستتار وأدبهن بذلك رسوله ﷺ وأحب للمرأة في السجود أن تضم بعضها إلى بعض، وتلصق بطنها بفخذيها، وتسجد كأستر ما يكون لها، وهكذا أحب لها في الركوع والجلوس وجميع الصلاة أن تكون فيها كأستر ما يكون لها، وأحب أن تكفت جلبابها وتجافيه راكعة وساجدة عليها لئلا تصفها ثيابها»

پێشەوا شافعی فەرموویەتی : خوای گەورە پەروەردەی ئافرەتانی كردووە بە خۆ داپۆشین، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بەوە پەروەردەی كردوون،

---

(١) مصنف عبد الرزاق (٥٠٦٦)
(٢) مصنف عبد الرزاق (٥٠٦٧)
(٣) مصنف عبد الرزاق (٥٠٦٨)

وە پێم باشە ئافرەت لەکاتی سوجدەدا خۆی کۆبکاتەوە، وە ئەژنۆی بنێت بە سکیەوە، وسوجدە ببات بەو پەڕی داپۆشراوی، ئەمەم بەلاوە باشە لەکاتی سوجدە و رکوع و دانیشتن و هەموو نوێژەکە کە بەو پەڕی داپۆشراویەتت بێت، وە پێم باشە پۆشاکەکەی بکاتەوە و بڵاوی بکاتەوە لەکاتی رکوع و سوجدەدا بۆ ئەوەی لاشەی دەرنەکەوێت[١].

ئەمە ئەوە دەردەخات کە خۆ داپۆشین واجبە لەسەر ئافرەت، بەو پێ یەی کە ڕێگە و شێوازی بۆ دانراوە لەنوێژدا کە داپۆشراو بێت و بیپارێزێت لەکاتێکدا لەپیرۆزترین پێگە و مقامدایە -کە لەبەردەم خوای گەورەیە بۆ نوێژ کردن-.

## شێوازی ئافرەت لەکاتی ئەنجامدانی سنورەکان و حەد بەسەریدا

بەهەمان شێوە لەکاتی جێ بەجێ کردنی سنورەکان-حەد- بەسەریدا ئافرەتەکە ئەبێت بەدانیشتنەوە بێت وە دەستەکانی دەگیرێت بۆ ئەوەی هیچی دەرنەکەوێت،

وەک چۆن لە علی یەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕدرێتەوە کە فەرموویەتی:

« تضرب المرأة جالسة والرجل قائما؛ ولأن المرأة عورة، وجلوسها أستر لها. وتشد عليها ثيابها؛ لئلا ينكشف شيء من عورتها عند الضرب».

«ئافرەت بەدانیشتنانەوە لێی دەدرێت و پیاوان بە ڕاوەستاوی، و لەبەر ئەوەی ئافرەت عەورەتە، دانیشتن بۆی باشترە و داپۆشراوترە، وە جلەکانی توند لەخۆی بپۆشێت، بۆ ئەوەی هیچ شوێنێکی دەرنەکەوێت لەکاتی لێداندا».



(١) الأم للشافعي (١ / ١٣٨)

## داپۆشین و شەرم لەدوای مردن

عائشە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی:

عن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالت: كنت أدخل بيتي الذي دفن فيه رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وأبي فأضع ثوبي، وأقول إنما هو زوجي وأبي، فلما دفن عمر معهم فوالله ما دخلته إلا وأنا مشدودة علي ثيابي، حياء من عمر إلا وأنا مشدودة علي ثيابي، حياء من عمر

من ئەچوومە ژوورەوە بۆ ماڵەکەم کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ باوکم تیادا بەخاک سپێردرابوون، ئاسایی جلەکانم دادەنا -چونکە لەناو ماڵی خۆی بوو-، دەمووت ئەوانەی ناو گۆڕەکان هاوسەر و باوکمن، دواتر کە عومەر لەگەڵیان نێژرا، سوێند بەخوا نەچوومەتە ژوورەوە تا بەتەواوی داپۆشراو نەبوومایە، شەرمم دەکرد لە عومەر -لەکاتێکدا مردوو بوو-[١].

سەرنجی شەرمی بکە!

شەرم لەمردوویەک دەکات کە تەنانەت کاتی زیندوویەتیشی کەسێکی پاک بوو، ڕەزای خوا لەدایکمان عائشە بێت.

عائشە ڕەزای خوای لێبێت بە ئافرەتانە دەفەرموو: لا تصفنني لأزواجكن" تكره أن توصف للرجال، وتحفظ غيرة زوجها نبي الله ' حتى وهو مفارق الدنيا.

«وەسفی من مەکەن بۆ هاوسەرەکانتان»، پێی ناخۆش بوو وەسف بکرێت لای پیاوان، وە دوای مردنی پێغەمبەری خواش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غیرەکەی دەپارێزێت[٢].



(١) رواه أحمد (٢٥٦٦٠)
(٢) مصنف ابن أبي شيبة (١٧٦٣٠)

## بەڵام شەرمی فاطمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای مردنی تووشی شۆکی زیاترت دەکات

ابن عباس ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت:

«. قد مرضت فاطمة مرضا شديدا فقالت لأسماء بنت عميس: ألا ترين إلى ما بلغت أحمل على السرير ظاهرا؟ فقالت أسماء: ألا لعمري، ولكن أصنع لك نعشا كما رأيت يصنع بأرض الحبشة، قالت: فأرنيه، قال: فأرسلت أسماء إلى جرائد رطبة، فقطعت من الأسواف وجعلت على السرير نعشا وهو أول ما كان النعش، فتبسمت فاطمة، وما رأيتها متبسمة بعد أبيها إلا يومئذ، ثم حملناها ودفناها ليلا».

« فاطمة نەخۆشیەکی توندی گرت، بە ئەسمای کچی عومەیس ی فەرموو: نابینیت گەیشتم بەچی؟ بە جێگە و بەئاشکرا بەرز ئەکرێمەوە و هەڵدەگیرێم- مەبەستی هەڵگرتنیەتی لەکاتی مردنیدا-، أسماء ووتی: شتێکت بۆ دروست دەکەم -

وەک دار میت وەک چۆن لەزەوی حبشه بینیم خەڵکەکەی دروستیان دەکرد، فەرمووی: پیشانم بدە، أسماء ناردی بەدوای داری خورمای تەڕ، لەناوچەی أسواف بۆی لێکرایەوە وەک داری مردوو درا بەسەر جێگەی مردووەکە کەلەسەری دادەنرێت و پێی داپۆشرا ئەمەش یەکەم جار بوو دار مردوو دروست بکرێت، فاطمە زەردەخەنەیەکی کرد، کە لەو ڕۆژەی باوکی واتە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە نەمبینیووە زەردەخەنەیەک بکات ئەو ڕۆژە نەبێت،دواتر کەوەفاتی کرد هەڵمان گرت پێی و ناشتمان بەشەودا»[١].

چیترتان دەوێت ئەی ئافرەتانی موسوڵمان؟

ئایا دایکانی باوەڕداران و ئافرەتانی هاوەڵان سەرمەشقمان نین؟

---

(١) رواه الحاكم في المستدرك (٤٧٦٣)

لەکۆتایدا..

هەمیشە شەریعەت پارێزەری ئافرەت دەکات بە پێگە و داپۆشین تا کۆتا ساتی ماڵئاوایی، هەندێک لەزانایان بەلایانەوە باش بووە کەگۆڕەکانیان دابپۆشرێت، وەک پارێزەری بۆیان.

ابن قدامە فەرموویەتی: « والمرأة يخمر قبرها بثوب، لا نعلم في استحباب هذا بين أهل العلم خلافا.

وقد روى ابن سيرين، أن عمر كان يغطي قبر المرأة.

وروي عن علي أنه مر بقوم قد دفنوا ميتا، وبسطوا على قبره الثوب، فجذبه وقال: إنما يصنع هذا بالنساء.

وشهد أنس بن مالك رضي الله عون دفن أبي زيد الأنصاري رضي الله عون ، فخمر القبر بثوب فقال عبدالله بن أنس: ارفعوا الثوب، إنما يخمر قبر النساء، وأنس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ شاهد على شفير القبر لا ينكر.

ولأن المرأة عورة، ولا يؤمن أن يبدو منها شيء فيراه الحاضرون».

« ئافرەت گۆڕەکەی دادەپۆشرێت بە پارچە قوماشێک، ئەمەش لای زانایان کۆدەنگیە کە لایان کارێکی باشە.

ابن سيرين دەگێڕێتەوە کە ابن عمر گۆڕی ئافرەتی دادەپۆشی.

وە دەگێڕدرێتەوە لە علی یەوە ڕەزای خوای لێبێت کەبەلای کۆمەڵێکدا ڕۆشت مردوویەکیان دەناشت، وە پارچەیەک قوماشیان دا بەسەر گۆڕەکەیدا، علی کابراکەی ڕاکێشا و فەرمووی: ئەم کارە بەس بۆ ئافرەتی مردوو دەکرێت.

وە أنس بن مالك کاتێک أبو زيد الأنصاري نێژرا ڕەزای خوایان لێبێت، قەبرەکەی داپۆشرا بە قوماشێک، عبدالله بن أنس ووتی: قوماشەکە لابدەن، تەنها ئەبێت گۆڕی ئافرەت دابپۆشرێت، وە أنس بن مالك لەوێدا وەستا بوو و ئامادە بوو لای گۆڕەکە و لەگەڵ قسەکەی عبدالله بوو.

لەبەر ئەوەی ئافرەت عەورەتە، گەرەنتی نیە کە شوێنێکی دەربکەوێت و ئامادەبووەکان ببینن[١].

---

(١) المغني لابن قدامة (٢ / ٣٧٤ )

والحمد لله رب العالمين

وصلى الله وسلم على خاتم النبيين والمرسلين

نبينا محمد وعلى آله وصحبه المجتبين

باوکی شام و دایکی شام

مانگی ذي القعدة | ١٤٤٤ کۆچی